ئیحسان نوری پاشا

# مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد

وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف



چاپی سێیەم

# مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کــــورد

نووسینی: ئیحسان نوری پاشا

پێشەکی و گۆڕینی: حەمەکەریم عارف

چاپی سێیەم: ٢٠٠٨

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : مێژووی ڕەگو ڕەچەڵەکی کورد

پێشەکی و گۆڕینی: حەمەکەریم عارف

تایپ:ڕزگار حەساری

هەڵەچن: سەرگوڵ محەمەد ئەمین

دیزاین : چاپەمەنی سایە

شوێنی چاپ : چاپخانەی ســـــایـــــــــە

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ : ٤٠٠٠

ژمارەی سپاردن : ( ١٤٧٠ )

ژمارەی مۆڵەتی چاپخانە (٣٢٤)

زنجیرەی کتێب ( ٢٥ )

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپو پەخشی

ســـــایـــــــــە

ناونیشان : سلێمانی- ئازادی سەرسەدەکە

٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣-٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤

<u>پێڕست</u>


- ⋆پێشەکیی وەرگێڕ.................................................٩
- ⋆پێشەکیی نووسەر..............................................٢٩
- ⋆ڕەگ و ریشەی نەژادی.......................................٣٢
- ⋆مێژووی کورد...................................................٥٩
- ⋆ئاراراتییەکان..................................................١٤٩
- ⋆نەمروودەکان..................................................١٦٦
- ⋆پوختەی نێوەرۆکی کتێبەکە..............................١٧٤
- ⋆پاشکۆ: کۆماری ئارارات.....................................١٨٩



ئیحسان نوری پاشا و یاشار خانمی خێزانی.

ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٦٢ لە ورمێ لە وێنەگری ( زاریا ) گیراوە.

# پێشەکیی وەرگێڕ

ئاگری، ئاگری، تۆ ئاگر بووی
لە نـــاو دنیا سەر بڵند بووی
لەسـەر کوردستان چرا بووی
هەلبـە ئاگری هەلبــە ئاگری

ئاگر درژاند ســـــەر سەران
رونـــــاهی درشـاند هـر دران
ئـــاردی دهژاند جــار جاران
هەلبـــە ئاگری هەلبـە ئاگـری

((١))

ئیحسان نـوری پاشـا، یەکێکـە لـە نـاوە درەوشـاوەکانی مێـژووی بزووتنـەوەی سیاسی رزگاریخوازی کورد، هەر لـە سـەرەتاوە بـە نەفەسـێکی نەتەوەییانـەی کراوەوە هاتۆتە مەیدان و تا دوا هەناسە، بەپێی توانای خـۆی و بـە گوێرەی کات و شوێن، لەسەر خەباتی خـۆی بـەردەوام بـووەو هـیچ سازشـێکی لەسـەر بـاوەڕی بـەرزی نەتـەوەیی خـۆی نـەکردووەو هـیچ ئامـانجێکی لـە ئامـانجی رزگاریی نەتەوەیی کـورد بـە زیـاتر نـەزانیوەو هـەموو ژیـانی خـۆی بـۆ ئـەو مەسـەلەیە تـەرخان کـردووەو مەینـەتی و دەربـەردەری زۆری لـەو پێنـاوەدا

چەشتووەو کێشاوە. بەڵام بەقەد ئارارات سەر بەرز بووە. ئیحسان نوری پاشا، یەکێك بووە لە ئەفسەرە کوردە بە تواناکانی سوپای عوسمانی و تورکیا، کە لاپەڕەیەکی پرشنگداری لە خەباتی رزگاریخوازی گەلی کوردی بندەستی تورکیا تۆمار کردووە.. کاتێ دەوڵەتی تورکیای تازە هاتە سەر کار، هەر لە سەرەتاوە لە گفت و بەڵێنەکانی سەبارەت بە ماڤ رەوای کورد ژێوان بوونەوە بۆیە خەڵکانی هۆشیاری وەکو ئیحسان نوری پاشا بیریان لەوە کردەوە، گونجاوترین رێگە بۆ وەدەست هێنانی ماڤ کورد بگرنە بەر. یەکێك لەو رێگایانە کاری سیاسی و دامەزراندنی حیزب و رێکخراوی سیاسی بوو. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٧دا رێکخراوی خۆیبوون بە ڕابەرایەتی جەلادەت عالی بەدرخان، لە شاری (بحەمدون)ی لوبنان بە مەبەستی ئازادکردنی باکووری کوردستان (کوردستانی تورکیا) دامەزراو یەکەم کۆنگرەی لە ١٩٢٧/٨/٥ بەست، لەو کۆنگرەیەدا ئیحسان نوری پاشا بەبێ ئەوەی خۆی لەوێ بێ، بە فەرماندەی هێزی شۆڕشگێڕی کورد لە ئارارات، هەڵبژێردرا .(واهان هاپازیان)ی ڕابەری حیزبی (داشناك)ی ئەرمەنیانیش لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوو..

ئەوە بوو بۆ ماوەی چوار ساڵان (١٩٢٧-١٩٣٠) لە دەڤەرێن ئارارات، لەگەڵ سوپای پڕ ئەزموونی تورکیای ساز بە تانك و تۆپ و باڵەفڕێن جەنگی، بەبێ هیچ جۆرە پشتیوانیەکی مادی یان مەعنەوی لەلایەن هیچ وڵاتێکەوە، درێژەی بە خەباتی رەوای ئەو قۆناغەی گەلی کوردی بندەست دا... ئیدی لە ئەنجامدا سوپای تورکیا بە کۆمەکی یەکێتیی سۆڤیەت و دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران هێزی شۆڕشگێڕی کوردیان لە دەڤەری ئارارات گەمارۆداو توانیان شکست بە شۆڕشگێڕانی کورد بێنن و خەڵکێکی زۆر قەتڵ و عام بکەنو

بەتۆبزی رایان بگوێزن بۆ ناوچە تورك نشینەكان. ئیدی ئیحسان نوری و هاوسەرەكەی ناچار پەنایان وەبەر دەوڵەتی ئێران بردا و ئەم كەڵەمێرە بۆ ماوەی چل و شەش دانە ساڵ (١٩٣٠-١٩٧٦) لە دەربەدەری و ئاوارەیی لە ولاتی ئێراندا تا نزیكی دوا ساڵەكانی تەمەنی لەوپەڕی هەژاری و بێ نەوایی و دەستكورتیدا ژیا، بەلام هەمیشە وەكو رابەرو فەرماندەیەكی مەزن و فیداكار، مەنگ و مەند، مەردو ڕەند رەفتاری دەكرد، بەپێی توانا و بە شێوازی جۆراو جۆری وەك نووسینی نامەو گوتاران، كتێبان دەربارەی كوردو رووداوەكانی شۆڕشی ئارارات درێژەی بە خەباتی خۆی داوە. ئیحسان نوری پاشا، زوانی فارسی بە باشی دەزانی و بەشێكی زۆری كتێب و وتارەكانی بە فارسی دەنووسی..

*** **

ئیحسان نوری لە نووسراوێكی خۆیدا لە ژێر سەرناڤی (ژ سەر بهوری مـن)دا دەڵێت:

"فەرماندەی گشتی نەتەوایەتی كورد، لە سالا ٢٥٤٢-٢٥٣٩ كوردی بەرەڤ ١٩٢٧-١٩٣٠ زاینی لەسەر چیای ئاگری لە ناڤا كوردستان توركی یی:

ئیحسان نوری:

ساڵ، ١٨٩٢دا، لە كوردستانی باكوور لە باژێری بەتلیس لە شەقامی ئەلی قولی (عەلی قولی) لە ماڵی ئەلی قولی دا هاتیمە گێتی. بەری ل مزگەوتی گوگ مەیدان، پاشی ڤوتابخانەی روشدییەی ئەسكەری بەتلیسدا، م خواند، شادەت نامەی شاگرد ئەوەلی راگرتم، سالا ١٩٠٧ چوومە ئەرزەگان (ئەرزەنجان) كە تیم اولا دیی ئەسكەری سالی پاشی من شورگریدا كەتم زانیشگاهی شەڕی.

زانیشگاها بەرێن ئستانبول، لە ١٩٠٩ خاندوارێن زانیشگاه شۆرش کرن، ئەزژ تەڤ وان بووم بەلام موئەسیر نەبووم. لە بەهاری ساڵی ١٩١٠دا بەپلەی ئەفسەری لە نێو ٣٢٩ دەرچووی ئەفسەریدا پلەی بیست و حەوتەمم بەدەست هێنا...)) بڕوانە کتێبی ژنرال احسان نوری پاشان ص ١٢ رحیم اشنویی محمود زادە.

★ ★★★

بە هەر حاڵ ئیحسان نوری پاشا، لە کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵەی خۆیبووندا، بە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئارارات هەڵبژێردرا، هەر چەندە کەسێکی سوپایی بوو، بەڵام لە سیاسەت و دنیای سیاسەتیش بی ئاگا نەبووەو هەرگیز کاتی دەست پێکردنی شۆڕشی ئاراراتی بە کاتێکی گونجاوو لەبار نەزانیوە. ئەوەتا سەرهەنگ عیسا پژمان لە کتێبێکی سێ بەرگی خۆیدا بە نێوی (کردها و کردستان) چاپی پاریس ١٩٩٢ هەندێ بیرەوەری خۆی دەربارەی ئیحسان نوری نووسیوەو لە زمانی ئەوەوە دەڵێت: "من لە کۆنفرانسی بەیروت نەبووم، لەو روونووس یا پەیامەی کە لەوێندەرەوە ناردبوویان، زۆر وەعدو بەڵێن و قسەی باشیان دابوو و کردبوو. بەڵام هەستم دەکرد کە بڕیارەکەیان لە رووی پراکتیکییەوە باش نییە، من بەر لە دەستپێکی ئۆپراسۆنەکان، هەموو مەسەلەکانم لەگەڵ نوێنەرانی ئەواندا باس کرد. کەمو کوڕی و گیروگرفتی کارەکانم پێ گوتن، و دەمزانی کارو مەسەلەکەی ئێمە بە رێگەی لەشکری و چەکداری چارەسەر ناکرێت. دەبێ چارەسەرێکی سیاسیانە بدۆزینەوە. منیش لەلای خۆمەوە لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی تورکیادا کەوتمە گفتوگۆ و تا رادەیەك هەندێ دەستکەوتیش بە

دەست هات. تورکەکان بەڵێنیان دا کە ئەگەر بگەڕێمەوە سەر کاری خۆم، بەکسەر پلەی سەرگوردیم دەدەنێو هەموو موچەکانی پێشووی خۆم و ئەو نەفسەرو دەرەجەدارانەی بەگەڵ من کەوتبوون دەدەنەوە. بوردنی گشتی دەدەن، بە مەرجێ چەکەکانمان تەسلیم بکەینەوە. تورك جێگەی متمانە نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر چەندە من لە رووی تەمەن و ساڵ و لە رووی سیاسییەوە لە پیاوان و سەرانی رۆشنبیر یا عەشایەری بەشداری کۆنفرانسەکە ئەزموونم کەمتر بوو، هەمیشە بە نامەو پەیام ئاگادارم دەکردنەوە کە لە دەستپێکی کاری سوپاییدا نابێ پەلە بکرێ، پەلە کردن لەم کارەدا، پەلە کردنە لە شکستی خۆمان بە دەستی خۆمان. من لەو کارو کردەوانەی کە کردوومن ژێوان نیم، و شانازییان پێوە دەکەم، بەڵام باوەڕم وابوو و ئێستاش هەر لەسەر ئەو باوەڕەم کە ئۆپراسیونی لەشکری (خۆیبوون) لە نالەبارترین هەلومەرجدا دەستی پێکرد..."

ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵەی خۆیبوون بریتی بوون لە. (قەدری جەمیل پاشا، جەلادەت عالی بەدرخان بەگ، حەسەن ئاغا حاجو، ئیحسان نوری پاشا، ئەکرەم جەمیل پاشا، مەدوح سەلیم و عارف عەباس). جەلادەت عالی بەدرخان و کامەران عالی بەدرخانی برای بزووتنەوەیەکی رۆشنبیریی گرنگیان بەرپا کرد کە بلاوکردنەوەی گۆڤارێن هاوارو روناهی و رۆژنامەێن روژانو و ستێر لە دیمەشق و بەیروت و بلاوکردنەوەی بەرهەمێن ئەدەبی جۆراو جۆر لە جوملەی چالاکیەکانی وان بوو. هەروەها ئەم جووتە برایە داهێنەری ئەلفبای لاتینی کوردیش بوون. (کردها، کندال- عصمت شریف وانلی، مستەفا نازدار، ترجمه (ابراهیم یونسی چاپ سوم ١٣٧٩).)

هەڵبەتە ئیحسان نوری پاشا، کە پەیوەندی بە شۆڕشی ئاراراتەوە کردوو ڕابەرێتی لەشکریی شۆڕشەکەی گرتە دەست، پێشوەختە، خۆی بۆ هەموو ناخۆشیو نەهامەتییەك ئامادە کردبوو، و ئامادە بوو لە پێناوی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی خۆیدا هەر باجێکی مادی یا مەعنەوی چەند گەورەش بێ بیدات و هیچ دەستکەوتێکی شەخسی بەلاوە گرنگ نەبێ و تەنیا شانازی بەوەوە بکات کە بەوپەڕی دڵسۆزی و پاکی ڕێبەرایەتی قۆناغێکی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کوردی کردووە و هەموو ئاواتێکی ئەوە بووە کە شایستەی ئەو شانازییە بێ.. هەڵبەتە شایستەی ئەو شانازیەو زیاتریشە.. ئەوەتا نووسەری کتێبی (ژنرال احسان نوری پاشا) مامۆستا ڕەحیم شنۆیی مەحمود زادە، کە کەسێکی زۆر نزیك بووە، لە ئیحسان نوری، بیرەوەری خۆی لەو بارەیەوە دەگێڕێتەوەو باسی ئەوە دەکات کە پاش ساڵی ١٩٥٨، دوای شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم لە عێراق، حکومەتی ئێرانی موچەی پەناهەندەیی ئیحسان نوری زیاد کرد، لە مانگانەی دوو سەدو پەنجا تمەنەوە، بۆی کرا بە هەزار تمەن و هەندێ وردە پێداویستی ناو ماڵیان بۆ دابین کرد و ژیان و گوزەرانیان کەمێك بوژایەوە. هەڵبەتە ئەم مانگانەیە لە دوا ساڵی تەمەنی ئیحسان نوری دا گەییە چوار هەزار تمەن و تۆزێك لە هەژاری و دەستکورتی دوور کەوتنەوە، نووسەر باسی ئەوە دەکات کە هاوسەرەکەی ئیحسان نوری بە گۆڕانی ژیانیان خۆشحاڵ بوو. بەلام جەنابی ئیحسان نوری بەلایەوە ئاسایی بوو، و دەیگوت: "ئەم گۆڕانی بارودۆخەو بایەخدانی حکومەت بەو، بە ئەنجامی شۆڕشی عێراق و گەڕانەوەی مەلا مستەفابارزانی و دەست پێ کردنەوەی سەر لە نوێی خەباتی نەتەوەیی کورد دەزانم نەك بەشتێکی دی..."

نووسەر لە لاپەڕە (٩٨)ی کتێبی نێو براودا دەڵێت:

"لە بیرمە، لە هاوینی ساڵی ١٩٥٦دا ڕۆژێك جەنابی ئیحسان نوری، بە خەمگینی باسی وەزعی نالەباری کوردانی دەکرد، هاوسەرەکەی هەڵیدایەو گوتی: ئیحسان تاکەی دەست لە کوردان هەڵناگریت، بۆ کوردان هیچ کاتێك خەمی ئەم وەزعە نالەبارەی ئێمە دەخۆن؟ ئایا لە ئێراندا ئەم هەموو کوردە هەن، جگە لە چەند کەسێك، ئەوانی دی دەزانن کە ئیحسان نوری کێیە و چۆن دەژی و ئەگەر تۆ وەکو ئەفسەرێك لە سوپای تورکیادا مابایتەوە و پەیوەندیت بە شۆرشی کوردانەوە نەکردبوایە، ئێستا لە تورکیادا پایەیەکی بەرزو ژیانێکی زۆر باشت دەبوو. جەنابی ئیحسان نوری، بەو قسانەی هاوسەرەکەی ناڕەحەت بوو، و گوتی: یاشار چما من بۆ ژیانی باشترو پایەی بەرزتر پەیوەندیم بە شۆڕشی کوردانەوە کرد؟ نەخێر، من ئەو کاتەی کە پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کرد پێشبینی ڕۆژانی سەخت و ڕووبەڕوو بوونەوەی مەرگم لە ریزی خەباتکارانی گیانفیدای کوردا کردبوو و هەرگیز لە کردەوەی خۆم ژێوان نیم. شانازی بەو ڕۆژە دژوارانەی ئەوساو ئەم ڕۆژە نادیارانەی ئێستا دەکەم، ئەوەندە بۆ من بەسە کە لە ژیانمدا لە پێناوی میللەتی زۆر لێکراوی خۆمدا، هەنگاوێکم ناوە..

((٢))

ڕەحیم شنۆیی مەحمود زادە لە کتێبەکەی خۆیدا باسی ئەوە دەکات چۆن بەرە بەرە لەگەڵ ماڵی ئیحسان نوری دا خوویان بە یەکەوە گرتووەو ئەگەر ماوەیەکی کەم سەری نەدایان نارەحەت دەبوون و چۆن هەندێ جار کە دەچووە ماڵی ئەوان یاشار خانم، هاوسەری ئیحسان نوری باسی ڕۆژانی سەختی جەنگی ئارارات و پەرستاری و برین پێچی زامداران و بۆمبارانی تورکیای بۆ دەکرد و چۆن هێشتا بووکی هەشت مانگە بووە، مێردەکەی پەیوەندی بە ڕاپەڕینی کوردانەوە کردووە و ئەوی بە تەنیا بە جێ هێشتووەو دوای ماوەیەك لەگەڵ دایکی دا و لە ڕێگەی سوریا و ئێرانەوە بە کۆمەکی ئەرمەنییەکان پەیوەندی بە مێردەکەیەوە کردووە، لە غارو ئەشکەوتانی ئارارات دا یاری غاری مێردەکەی و شۆڕشگێڕان بووە، لە کاتی شکستی کورد لە ئارارات دا، ئەو خشڵ و زێڕانەی کە مێردەکەی لە کاتی زەماوەندا بۆی کڕی بوو و یا باوك و دایك و براکانی خۆی دابوویانێ، بۆ ئەوەی بە دەستی سەربازانی تورك نەکەوێ‌و بۆ ڕۆژانی تەنگانەی خۆی و

مێردەکـەی هـەڵی بگـرێ، لـە دەسـکەواندا کوتیـونی و کردونـی بـە وردە ناسنجاو.. باسی رۆژانی سەختی دوای پەنا بردنە ئێرانی سـەردەمی رەزا شا پەهلەوی و زیندانی بوونی ئیحسان نوری بۆ ماوەی نـۆ هـەیڤان لـە ئـەمن و دوور خستنەوەی بۆ ساوە دەکرد.. دەیگوت: لە ترسی ئەوەی نەبا مێردەکـەم لـە زینـدانـدا ژەهـر خـوارد بکـرێ، هـەموو رۆژێ خـواردنی ئیحـسانم ئامـادە دەکردو لەگەڵ دایکم دا بۆ زیندانم دەبردو دەمدا بە ئیحسان نـوری. دایکـی یاشار خانم لە رۆژانی تەنیایی یاشار خانم و ساڵانی نـەفی لـە کرمـان و سـاوە لەگەڵ ئەواندا بووە، تا لە سـاڵی ١٩٤١، لـە تـاران مـردووە، لـە گۆڕسـتانی شـاە عەبدولعەزیزیم نێژراوە. هەروەها باسی ئەوەی دەکرد کـە لـە مـاوەی دووەم جەنگی جیهانیدا کە گوێزراونەتەوە بۆ تاران، هەندێ خشڵ و زێڕی ژنانـەی هـەبووە کـە لـە تورکیـاوە دەگـەڵ خـۆی هێنـابوو، بردبوویـان لـە بـازاڕ فرۆشتبوویان و بە پارەکەی کامیونێکی باری دەکڕن و لە رێگەی ئاشـنایەکی ئەرمەنی سەردەمانی شۆڕشی ئاراراتەوە، شوفێرێکی ئەرمەنی بۆ دەگـرن، تـا بـە دەرامـەتی کامیونەکـە ژیـانی خـۆ بـەڕێوە بـەرن، چـونکە مانگانـەی پەناهەندەییەکەیان لەو سەروبەندەدا زۆر کەم بووە، بـەڵام ئۆتۆمبیلەکـەیان لەبری قازانج، زەرەریان لێدەداو ناچار بـە زەرەر دەیفرۆشـنەوە.. و بـە هـەر حاڵ یاشار خانم پـشت و پەنایـەکی زۆر چـاکی ئیحـسان نـوری پاشـا دەبێـت، ئەم ژنە ناوی خەدیجە یاشار تەکتامیش و تورك بوو، بە تورکی ئەستەموڵی و فارسی قسەی دەکرد، لە کوردی تێ دەگەیشت، بەڵام نەیدەتوانی لە چـەند وشەو رستـەیەکی کـەم بـەولاوە قـسەی پـێ بکـات. کارەکـەرێکیان هـەبوو بـە نێـوی زەهـرا بەهنامـە، کـە داك و بـابی کـورد بـوون، و لـە سـێ سـاڵیەوە هێنابوویانـە لای خۆیـان، لەگـەڵ یاشـار خانمـدا فێـری تـورکی بووبـوو و بـە

**تورکی قسەی دەکرد... هەر چەندە ئیحسان نوری کەسایەتیەکی نەتەوەیی بوو، بەڵام هیچ کاتێك داوای لە هاوسەرەکەی نەدەکرد بە کوردی قسە بکات یان فێری کوردی ببێ..**

*************

**ئیحسان نوری پاشا، کەسایەتیەکی نەتەوەیی کراوەی واقیع بین بووەو لە هەر توندڕەوییەکی مەزەبی و ئایدولۆجی دوور بووە. کوردو تەبایی و رزگاری کوردی زۆر مەبەست بووە. هەر چەند زۆری حەز کردووە راستەوخۆ لە خزمەتی کۆماری مەهابادا بێ، بەڵام لەبەر هەندێ هۆ، کە تا ئێستا روون نییە، رێگە نەدراوە... لەگەڵ ئەوەشدا دوورو نزیك پەیگیری رووداوەکانی کردووە، گەلێك بە خەمەوە بووە، ئەوەتا دکتۆر هاشم شیرازی لە کتێبی (خاگرات دکتر شیرازی)دا لە باسی دیدارێکی ئیحسان پاشا وپێشەوا قازی محەمەد لە تاران، دەڵێ بەپێشەوای گوت: " جەنابی قازی، کورد کە نهو خەریکی دروستکردنی بینایەکن، نابێ بەر لە دروستکردنی بیناکە، لەسەر ڕەنگی ناوەوەی بینایەکە بەگژ یەکدا بچن.))**

**یان لە دیداری دووەمیا، لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی، لە ساڵی ١٩٧٤، وەکو نەتەوەییەکی مارانگەستە، ئومێدی سەرکەوتنی بۆ دەخوازێت، بەگومانێکی پڕ لە دڵسۆزییەوە پێی دەڵێت: ".. ئومێدەوارم ئەم بزافەی کوردو ئەم پەناهەندەبوونەیان بۆ ئێران، دووچاری هەمان چارەنووس نەبێت کە ئێمە لە ئارارات دووچاری بێ بەڵێنیو پەیمانشکێنی رەزا شا بووین، چونکە ئێمەی کورد خۆمان لەگەڵ ئێرانیاندا بەهاو نەژاد دەزانی و تەسەورمان نەدەکرد ئێرانیەکان خیانەتمان لێ بکەن، لێ رەزا شا خیانەتی**

لێکردین..."ئەوە بوو نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ بەسەر بزووتنەوەی رزگاری خوازی کوردیدا هات و هەڵبەتە یەکێك لە فاکتەرەکانی ئەم نسکۆیە خیانەتی محەمەد رەزا شای ئێران بوو..

بەڵام ئیحسان نوری پاشا، تاکو مردیش هەر پیاوێکی مەردو ڕەند، مەنگ و بە هەیبەت و ویقار، بەورەو نەفس بەرز، گەشبین بەئایندەو هەرگیز لە هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی خۆی ژێوان نەبوو، ئارمی خۆیبوون لە ماڵەکەیدا و بە بەرزییەوە هەڵواسرابوو کە بریتی بوو لە (خەنجەرێکی ئەستوونی لە ناوەڕاست و گوڵە گەنمێك لەلایەکی و قەڵەمێك –پەڕە مووچێك- لەلایەکەی تری، کە لە خوارەوە یەکیان دەگرتەوە، نیوە هەتاوێك لەسەر نووکی خەنجەرەکەوە هەبوو، هەرسێکیانی غەرقی تیشکی خۆی دەکرد).

بەو جۆرە، ژیانی دەگوزەراند تا لە ساڵی ١٩٧٦دا بۆ جاری دووەم ماتۆڕ لە نزیکی ماڵەکەی خۆی لێیداو دوای هەفتەیەك ژیانی پڕ لە شانازی و سەربەرزی جەنەڕاڵ ئیحسان نوری پاشا، (ئیحسان جەبرانی) لە تیرەی حەسە سووری جەبرانی، کوڕی نوری، لە دایکبووی ساڵی ١٨٩٢، لە ١٩٧٦/٣/٢٥دا لە تاران کۆتایی هات. لە پشتی وێنەیەکی ئیحسان نوری پاشا، کە بۆ پرسەکەی لە ماڵی خۆیدا دانرا بوو، جەنابی مەلا جەمیلی رۆژبەیانی ئەمەی نووسی بوو: " ئیحسان نوری پاشا لە ساڵی ١٢٧٣ی هیجری شەمسی لە دایك بوو، لە١٣٥٤/١٢/٢٨ سەعات شەشی پاش نیوەڕۆ ماتۆڕسکیل لێیداو رۆژی پێنج شەممە ١٣٥٥/١/٥ سەعات شەشی بەیانی لە خەستەخانەی سینا وەفاتی کردو سەعات سێی پاش نیوەڕۆ لە گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا، کەرتی نۆ، بە خاك سپێردرا).هەڵبەتە گۆڕەکەی لە بەهەشتی زەهرای تارانە، کەرتی نۆ، ریزی پەنجاو هەشت، ژمارە (١٢).

هەڵبەتـە مـاتۆڕ سـوارەکە گیرابـوو، درابـووە دادگـا، بـەڵام پـاش ماوەیـەك ئەوقاتەکـەی پاشـار خـانم پێـی گوتبـوو، دادگـایی و سـزاخکردنی قـانوونی بکوژی ئیحسان نوری پاشا، بێ سوودەو هیـچ ئـەنجامێکی نـابێ. پاشـار خـانم پێـی وابـوو مەبەسـتی ئەوقاتەکـە ئەمـە بـوو کـە لەگینـە ساواك دەسـتی لـە کوشتنی ئیحسان نوری پاشادا هەبوو بێ.

* * *

وەکـو مامۆسـتا ڕەحـیم شـنۆیی مـەحمود زادە لـە کتێبەکەیـدا دەیگێڕێتـەوە، ئیحسان نوری پاشا، کە منداڵی نەبوو لە پارچە کاغەزێکی چکۆلەدا ساڵانێك پێش مردنی، وەسـێتی کردبوو کـە هەرچییەکی هەیـە لـە پـاش مردنـی بـۆ هاوسەردکەیەتی و مافی چ کەسێکی تری بەسەرەوە نییە... نووسـەری بـەڕێز دەڵێـت ئــەو وەســێت نامەیــە لای منــەو هــەموو ســاڵێك مێژووەکــەی تازەکراوەتـەوە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە یەشـارخانمی یـەکجار خـۆش ویستووە.

بە هەر حاڵ ئیحسان نوری پاشا، تەنیا دەفتـەرێکی پاشـەکەوتی هـەبووە کـە مانگانـەی پەناهەندییەکـەی لـە بانکـدا بـۆ دەخرایـە سـەرو خـۆی بـەپێی پێویـستی لێـی دەردێنـا..هـەموو پاشـەکەوتی ئـەم دەفتەرچـەیەی لـە ڕۆژی هەشتەمی بـەر لـە مردنەکـەی تـەنیا هـەزارو سـەدو پـەنجا ڕیـاڵ بـووە. لـەو ساڵەدا (١٩٧٦) دۆلارێکی ئەمریکی بەرابنەر هەفتا ڕیاڵی ئێرانی و یەك کیلۆ گۆشتی مەڕ بە سەدو چل ڕیاڵ بوو.

ئیحـسان نـوری تـا ڕۆژی مردنـی هـەر کرێـچی بـوو، هـیچ جـۆرە مـوڵکێکی ئەقاری نەبوو. ژنەکـەی برێـك زێـڕو خـشڵی ژنانـەی هـەبوو کـە هـیچ کـاتێ

بەکاری نەدەیەنا، هەموو جار یاشار خانم دەیگوت ئەم تۆزە خشڵ و زێڕەم بۆ ڕۆژانی تەنگانە داناوە.

ناو ماڵەکەی ئیحسان نوری بریتی بوو لە یەخچاڵێك، تەلەفزیۆنێك، رادیۆیەکی بچووك کە هەمیشە لە تەنیشت ئیحسانەوە بوو، چەند تەختە قاڵییەکی ئاسایی کۆن و چەند قەنەفە و کورسی و مێزێکی نانخواردن و هەندێ وردەو پەردەی دیکەی ناو ماڵ، دیارە ئەم ناو ماڵەش لەگەڵ زیادکردنی مانگانەی پەناهەندەییەکەیدا وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کردووە، دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ی عێراق و گەڕانەوەی مستەفا بارزانی لە سۆڤیەت و سەرهەڵدانەوەی سەر لە نوێی مەسەلەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا، لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە دابین کرابوو... یاشار خانمیش چونکە ئافرەتێکی کەیبانۆو بە سەلیقە بوو، لەگەڵ زیاد کردنی مانگانەکەی ئیحسان دا توانی بووی هەندێ پاشەکەوت بکات و بڕێك خشڵ و زێڕان بکڕێ و خۆی گوتەنی بۆ ڕۆژانی تەنگانەی هەڵبگرێ.

بەڵام دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٧٨ی ئێران، مانگانەکەی ئیحسان نوری کە بە ژنەکەی دەبڕا، پاش ماوەیەك بڕدرا، کە یاشار خانم لە نامەیەکدا بۆ کەریم سنجابی وەزیری کاروباری دەرەوەی کۆماری ئیسلامی داوای کردەوەو ئەوە بوو داواکەیان جێبەجێ کردو موچەکەیان بۆی گەڕاندەوە...

یاشار خانم، ژنێکی بە ئەمەك و دڵسۆزی ئیحسان نوری پاشا بوو، تەنانەت پاش مردنی مێردەکەشی، وێڕای ئەوەی هێشتا هەر هاووڵاتی تورکیا و پەساپۆرتی تورکی هەبوو، دڵی نەهات بەجێی بێڵێ و لەگەڵ زەهرای کارەکەریاندا تا ساڵی ١٣٦١هەر لە تاران و لە ماڵەکەی خۆیاندا مایەوەو هەمیشە هەر ئیحسان نوری لە یاد بوو، و وێنەیەکی بچووکی ئەوی لە چوار

چێوەیەکی شووشەیی گرتبوو و هەمیشە بە یەخەیەوە بوو... تەنانەت (سەرهەنگ عیسا پژمان)ی بەرپرسی کاروباری کورد لە دەزگای ساواك، لە ئەمریکاوە چەند جارێك تەلەفۆنی بۆ دەکات کە خۆی و زەهرا بچن بۆ ئەمریکا و بە یەکجاری لەوێندەر ئاکنجی ببن، کەچی یاشار خانم لە وەڵامیا دەڵێت بەبێ ئیحسان هەموو شوێنێکی دنیا بۆ من وەکو یەکە و فەرق ناکات...

عیسا پژمان دەیگێڕێتەوە ئەو ئێوارەیەی کە ماتۆڕسکیل لە ئیحسان نوری دابوو و بە پەلە گەیاندبوویانە خەستەخانە، نەیان هێشتبوو یاشار خانم بچێتە دیاری، بە تەلەفۆن ئەوی ئاگادار کردۆتەوە، ئەویش شوفێرەکەی و پاسەوانێکی خۆی دەنێرێ بە شوێنی داو داوا لە دکتۆرەکان دەکات ڕێگەی بدەن بێتە دیار مێردەکەی.. کاتێ کە دێتە ژووری و چاوی بە ئیحسان دەکەوێ، دەبورێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی، خێرا هەڵی دەگرنەوەو لەلای ئەووەوە لەسەر تەختێکی دەخەوێنن، دکتۆرەکان خێرا چەند دڵۆپە دەرمانێکی دەدەنێ و دەرزییەکی لێ دەدەن، دوای چەند دەقیقەیەك بە هۆش دێتەوەو دەکەوێتە گریەو زاری، دکتۆرەکان دڵخۆشی دەدەنەوە و پێی دەڵێن کە وەزع و حاڵی مێردەکەی باشەو پێویستی بە ئیسراحەتە و دوای چەند ڕۆژێك چاك دەبێتەوەو جێگەی نیگەرانی نییە. ئیدی بە کۆمەکی پژمان هەڵدەستێ، دەچێتە دیار ئیحسان، دەستی دەگرێت، نێو چەوانی ماچ دەکات و دەڵێت: "ئیحسان گیان، ئیحسان گیان، بە قوربانت بم، بریا ماتۆڕ لە منی دابا، ملم بشکێ، بۆ تۆم بۆ کڕینی شتێکی هیچ نارد؟ خودا من بکوژێت.."

بەڵێ ئەم ژنە بە ئەمەك و ڕەسەنەش لە ڕۆژی ١٣٦٢/١٠/١٢دا لە نەخۆشخانەی بانکی میللی تاران کۆچی دوایی کردو ڕێوردسمی ناشتن و

پرسەی لەلایەن ماڵباتی بارزانی و دۆستانی ئیحسان نوری پاشاوە بۆ ئەنجام دراو لە گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا، کەرتی ۹۷، ریزی ۱٦۳، ژمارە (۳۰)دا بە خاك سپێردراو لە خاکی غەریبی دا کۆتایی بە ژیانی هات..

رەحیم شنۆیی مەحمود زادە، باسی ئەوە دەکات کە یاشار خانم و زەهرا، سێ مانگێك بەر لە مردنی، لە ماڵی ئەوان، لە ورمێ بووەو دەربارەی کتێبانی راپەڕینی ئارارات و بیرەوەرییەکانی ئیسحان و بیرەوەرییەکانی خۆی (یاشار خانم) گوتوویەتی: "من پار (۱۹۸۲) ئەو بەرهەمانەم داوە بە جەنابی ئەیوب بابۆ (پێ رەش)ی برازای مەلا مستەفا بارزانی تا لە سویسرا بە چاپیان بگەیەنێ و ئەیوب گوتویەتی پارەی فرۆشەکەی نزیکەی لە سەدا پەنجایت یان هەموویت بۆ دەنێرمەوە."، جا ئەوەندی من ئاگادارم راپەڕین یان شۆڕشی ئارارات لە گۆڤاری هیوا، لە پاریس لە ساڵی ۱۹۸۵دا بە شێوە زاری بادینی بڵاوبووەتەوەو دوایی لە رۆژنامەی گەلدا بە عەرەبی تەرجەمەو بڵاوبووەتەوە، لە ساڵی ۱۹۸٦دا لەلایەن عیسمەت شەریف وانلییەوە تەرجەمەی فەرەنسی کراوە، دوایی سەلاح بەرواری لە بادینییەوە کردویەتی بە عەرەبی. بەڵام کتێبی (ژ سەر بوری من یا ژیانی من) و بیرەوەرییەکانی یاشار خانم تا ئێستا چاپ و بڵاو نەبووەتەوە..

رەحیم شنۆیی مەحمود زادە دەڵێت دوای مەرگی یاشار خانم، من و دۆستانی ئیحسان نوری واتە دکتۆر عەلی مەولەوی و دکتۆر جەعفەر رەحمانی و دکتۆر شیرازی هەواڵی مەرگی یاشار خانم‌مان بە کچ و کوڕێکی برازای بە ناوانی بنگوڵ توفتامیش و چاغلار تۆفتامیش لە ئەستەموڵ دا، لێبڕاین لەبەر ئەوەی زەهرا عومرێك، لە منالییەوە تا مەرگی ئیحسان نوری پاشاو یاشار خانم لە خزمەتی ئەواندا بووە، ئەو کچ و کوڕە رازی بکەین کە

زەهرا بکرێ بە میرات گری یاسایی پاشار خانم و هەر چیەك لە پاش ئەوو مێردەکەی (ئیحسان) بەجێماوە بدرێ بە زەهرا، و ئەم کارە سەری گرت و زەهرا بوو بە خاوەنی ناو ماڵ و هەندێ زێڕو خشڵی پاشار خانم کە بۆ ئەو کاتە نزیکەی پتر لە ملیۆنێك تمەن دەبوو. ئەو سەردەمە نرخی هەر دۆلارێکی ئەمریکی نزیکەی سی ((٣٠) تمەن بوو.

بە هەر حاڵ زەهرا، دوای چەند ساڵێك پاش مەرگی پاشار خانم، بۆ رەحیم شنۆیی مەحمود زادەی دەگێڕێتەوە کە پاشار خانم پێی گوتبوو (بە زەهرا) کە قەرارە ئەیوب بابۆ، دوای چاپ کردنی کتێبەکان بێ بۆ تاران.. لە کاتی نەخۆشی و لە دوا رۆژەکانی ژیانیدا بە زەهرای گوتووە کە ئارمی ئارارات، ئەوەی بەسەر سەری وێنەیەکی دوو قۆڵی من (پاشار خانم) و (ئیحسان )ـەوە هەڵواسراوە، لەگەڵ ئەڵقەی دەزگیرانداری ئیحسان و من کە نێوی ئیحسان و پاشاری لەسەر هەڵکەندراوە و ئەسڵی کتێبە دەستنووسەکانی ئیحسان نوری لەمەڕ شۆڕشی ئارارات و ژیانی ئیحسان و بیرەوەرییەکانی من (پاشار) و سەعاتە قەدیمییەکەی ئیحسان، بدات بە ئەیوب بابۆ تا ئەویش بیدات بە دەزگاو رێکخراوێکی کوردی کە بتوانێ ئەو شتانە بۆ نەتەوەی کورد بپارێزێ... زەهرا بە رەحیم شنۆیی دەڵێت کە هەموو ئەو شتانەی لە تاران داو بەر لە دەزگیرکردنی مێردەکەی (خەلیل) داوە بە ئەیوب بابۆ. بەڵام سەعاتە قەدیمییە زێڕەکەی ئیحسان نوری نەداوە بە ئەیوب بابۆ، چونکە قەرار بوو ئەیوب بابۆ لە فرۆشی چاپی بیرەوەریەکانی ئیحسان نوری و پاشار خانم پارەی بۆ بەرێ و بۆ نەبردووە. زەهرا پاشتر سەعاتەکەی بە نرخی ئەو زێڕەی کە تیای بوو، فرۆشتبوو.

★ ★ ★

ئیحسان نـوری پاشـا، زمـانی فارسـی بـه باشـی دەزانـی و بەشـێکی کتێـب و وتارەکانی به فارسی نووسیوەو بڵاوکردۆتـەوە. نـاوبراو، لـه مـاوەی ئـاکنجی بوونیا له تاران توانی هەردوو کتێبی (تاریخ ریشەی نـژادی کـرد) و (وقـائع ارارات) بنووسێت و بڵاویکاتەوە.

(وقـائع ارارات) لـه هەفتەنامـەی کوهـستان، چـاپی تـاران، کـه بەڕێوەبـەرو خودان ئیمتیازەکەی جەنابی دکتۆر ئیسماعیل ئەردەڵان بوو، له ساڵی ۱۳۲٤ی هـەتاوی (۱۹٤٥) بـه زنجـیره لـه چـەند ژمارەیەکـدا چـاپ و بڵاوبووەتـەوە، هەڵبەته ئەم (وقایع ارارات)ەی که ئێـستا بـه کتێـب چـاپ بـووە، لـه هەنـدێ شـوێن دا جیـاوازی لەگـەڵ ئـەوەی هەفتەنامـەی کوهـستاندا هەیـه. چـونکه ئیحسان نوری لەبـەر وەزع و حـاڵی پەناهەنـدەیی خـۆی نـەیتوانیوە هـەموو شتێك بنووسێت و بیانوو به دەستی سانسۆرەوە بدات، هەمیشه ئەو کتێبەی شاردۆتەوە تـا دەسـتی مـامورانی ئاسـایش نەکـەوێ و لـه دەرفـەتێکی لـەبارو گونجاودا چاپ و بڵاو ببێتەوە.

ئـەم هەفتەنامەیـه لـه رۆژی ۷ی بەهمـەن/۱۳۲۳! دەسـتی بـه کـار کـردووەو لـه ئەسفەند مانگی ۱۳۲٥ (۱۹٤٦) داخراوە، تێکڕا هەشتاو چوار ژمارەی لێ چاپ و بڵاوبووەتەوە.. هـەروەها کتـێبی (تـاریخ ریـشه نـژادی کـرد)ش بـەزنجیرە لـه هەمان هەفتەنامەدا بڵاودەبووەوە ،بـەڵام بـەهۆی راگـرتنی هەفتەنامەکەوە، تەواو نەبوو... "اسرار بارزان"ش که له نووسینی دکتۆر ئیسماعیل ئەردەڵان بووە، به زنجیره لـه هـەمان رۆژنامـەدا بڵاودەبـووەوە.. کتـێبی (تـاریخ ریـشه نژادی کرد) لـه سـاڵی ۱۹٥٥دا لـه چـاپخانەی سـپهر چـاپ بـووە... ئـەم کتێبـه لەسـەر ئـەرکی شەخـسی پیـاوێکی مـەهابادی، دانیـشتووی تـاران، بـه نێـوی حاجی مستەفا ئەتمیش که له تارانـدا خـەریکی بازرگـانی بـوو، چـاپ کـراوە،

چاپی کتێبەکە نزیکەی هەزارو پێنج سەد تمەنی ئەو کاتەی تێ چووە، گوایە نێو براو لەسەر راسپاردەی جەنابی شێخ عەبدوللا ئەفەندی گەیلانی زادە، ئەو بڕە پارەیەی بۆ چاپی کتێبەکە داوە. بێگومان ئیحسان نوری بە خۆی ئەو پارەیەی پێ هەڵنەسوڕاوە تا کتێبەکەی پێ چاپ بکات. دیارە لەو سەرو بەندەدا وەشانخانەکانیش ئامادەی چاپ کردنی کتێبی نێو براو نەبوون یان پارەیان نەبووە. ئەم کتێبە ئەوسا بە تیراژی سێ سەد- چوار سەد دانە چاپ کراوە، نرخی هەر دانەیەك چوار تمەن و نیو بووە، نزیکەی (٣٠-٤٠) دانە دراوە بە ئیحسان نوری بۆ خۆی بیفرۆشێتەوە.. تەنانەت رەحیم شتۆیی مەحمود زادە پێنج دانەیەکی بۆ فرۆشتووە..

جەنابی ئیحسان نوری پاشاو مامۆستا ئیبراهیم پورداود گرتنی نەینەوای پایتەختی ئاشوریەکان لەلایەن هوخشترەی پاشای مادەوە، بە گوێرەی کەتیبەو بەردەنووسەکانی ئاشۆر بە ساڵی (٦١٢پ.ز)دادەنەن وچونکە پێیان وابووە کوردی ئیستا پاشماوەی مادەکانن، بۆیە ساڵی ڕوخانی نەینەوایان لە(٦١٢پ.ز) بە مێژووی کوردی- مادی داناوە.. ئیحسان نوری پاشاش ئەو ساڵەی بە مێژووی دامەزراندنی شاهنشاهی ماد زانیوەو لە کتێبەکەی خۆیدا (مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد) دەڵێت: "چونکە روخانی دەوڵەتی ئاشور کە لە ساڵی ٦١٢پ.ز بە دەستی هوخشترەی پاشای بە توانای ماد ئەنجام دراوە، بۆیە میللەتی کورد-ماد- ئەم مێژووەیان بە سەرەتای مێژووی نەتەوەیی خۆ قەبوڵ کردووە" و ئیحسان نوری یەکەمین کەسە کە ئەم مێژووەی بەناوی مێژووی کوردەوە تۆمار کردووە.

جەنابی ئیحسان نوری بە گوتەی خۆی دوو مەبەستی لە نووسینی کتێبی (مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد) هەبوە یەکەمیان ئەوە بووە بە پێی

توانای خۆی مێژووی کۆنی نەتەوەی کورد روون بکاتەوە، دووەمیان ئەوە بووە کە وەڵامێکی کتێبی (کردو پیوستگی نژادی و تاریخی او)ی مامۆستا رەشید یاسمی بداتەوە، کە بە خۆی کورد بووەو بە هاندانی رەزا شا پەهلەوی ئەو کتێبەی داناوە و مەبەستیش ئەوە بووە وەکو لە ناوی کتێبەکەوە خۆیایە رەگ و رەسەنی کورد بەرێتەوە سەر پارس، لە کاتێکا بەرای ئیحسان نوری کورد، پارس نین، بەڵکو کورد یا مادو پارس پەیوەندی نەژادیان هەیە.. بۆیە (مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد) وەڵامێکە بۆ مامۆستا رەشید یاسمی..

جا خوێنەری ئازیز. فەرموون ئێوەو مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، بە ئومێدم جێی رەزامەندی بێ و کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردیدا بگرێت.

حەمەکەریم عارف

سلێمانی ۲۰۰۸

تێبینی:

***بۆ نووسین و ئامادەکردنی ئەم پێشەکییە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:***


١- ژنرال احسان نوری پاشا، رحیم اشنویی محمود زاده، چاپ اول، ١٣٨٦.

٢- کردها، حسن ارفع، لندن چاپ دانشکده اکسفورد نیویورك، تورنتو ١٩٦٦

٣- کردستان وکرد در اسناد محرمانە. بریتانیا. و. همدی ترجمە بهزاد خوشحالی، چاپ اول، ١٣٧٨.

٤- شورش کردهای ترکیە و تأثیر ان بر روابگ خارجی ایران، کاوه بیات،چاپ اول ١٣٧٤.

٥- وقائع ئارارات، بە کوشش کاوه بیات،چاپ اول ١٣٧٨.

٦- کردها، کندال – عصمت شریف وانلی، مصگفی نازدار ترجمه ابراهیم یونسی چاپ سوم، ١٣٧٩.

٧-کریس کوچیرا، کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستەم دا، چاپی چوارەم ٢٠٠٧ کتێبفرۆشی ئاوێر. و:حەمە کەریم عارف

# مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد

## پێشەکیی نووسەر

ئەو کەسانەی کە لە کارێن پڕ شانازی ڕابردووی میللەتی خۆ بێخەبەرن، ناتوانن ئارمانجی پێشخستن و بەرز کردنەوەی ئاستی میللەتەکەی خۆیان لە مێشکی خۆدا پەروەردە بکەن.
بێئاگایی لە ڕابردوو دەبێتە مایەی فەرامۆش کردنی ئایندە‌ا دەڵێن شانازی بە کێلی قەبرەوە ناکرێت، لێ سەر هەڵدان و بتەوبوونی هەستی پاراستنی ئازادی لە نێو میللەتاندا پێوەندی بە زانینی کارە پڕ لە شانازیەکانی باب و باپیرانەوە هەیە‌ا جێی خۆیەتی بڵێین کە ئەو شانازیانە چرای ڕێنوێنی ڕێگەی شکۆی میللەتانە. نووسەر، لە کاتێکدا کە دان بە کەمدەستی زانستانەی خۆیدا دەنێت، لێ چونکە بەشێك لە کارەساتەکانی ئەم میللەتە زۆر لێکراوەی وەئەستۆیەو بە پشتیوانی خوێندنەوەو موتالای ئەو نووسین و سەرچاوانەی لەسەر کوردو کوردستان نووسراون، دەستی داوەتە نووسینی ئەم نامەیە، هێڤیدارە سوودی خۆی بگەیەنێ.
مەبەستم ئەمە نییە مێژووی کوردو کوردستان بنووسم، بەڵکو ئەوەندەم گەرەکە خزمەتی قەومێکی ئێرانی نەژاد بکەم کە خەریکە لەلایەن نەژادەکانی دیکەوە لە نێو دەبرێت. هەر ئەوەندەم گەرەکە ئەم میللەتە

ڕەشید و عەگید و زۆر لێکراوە لە گومناوی دەرباز بکەم، نەیەڵم لە شەرەفی نەژادی ئێرانی خۆی مەحروم بێ، ئەگەر چی لەوەیە لە سایەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی خەمناکی ئەم میللەتەدا باسکردنی رەچەڵەك و کورد بوونی هەندێ هۆزو تیرە کە دەوڵەتانی گەورەیان دامەزراندووەو باسکردنی زنجیرە پاشایانێك کە وڵاتانیان فەتح کردووەو باسی کورد بوونی پێغەمبەرانێك کە رێی دروستیان بە مرۆڤایەتی نیشانداوە، هەندێ سەیرو سەمەرە بێتە بەرچاو وا وێنا بکرێ نووسەر کەوتبێتە ژێر کاریگەریی توندڕەوانەی هەستی ناسیونالیستیەوە. بەڵام پاش خوێندنەوە و موتاڵای وردی ئەم کتێبۆکەیە دەردەکەوێ کە نووسەر لە دەمارگیری و توندڕەوی دوور بووە.
مێژووی (کورد و کوردستان). بەزمانی کوردی، بەرهەمی خامەی بە نرخی نووسەری گەورەی کورد ئەمین زەکی بەگی رەحمەتی، و کتێبی (کورد و پەیوەندییە نەژادییەکانی) مامۆستای زانستگە (رەشید یاسمی) رەحمەتی لە نووسینی ئەم نامەیەدا نەك هەر ئەرکی گەڕان و پشکنین و پەیگیریان لە کۆڵ بەندە کردووەتەوە، بەڵکو زەحمەتی زێدە روونکردنەوەشیان لە سەرشان سووك کردوم.. لێ نا بێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە: میللەتێك کە بە زەبری بریقەی شمشێر تاریکی مێژووی روناك کردوەتەوەو لە هەموو سەرو بەندێکا بە دەنگی دلێرو هەڵوێستی قارەمانانەی خۆی دژمنانی خۆی هێناوەتە لەرزین، حەیف و مەخابنە ئەو نازناوی مەردایەتی و جەنگاوەریەی کە لە وشەی کوردا بەرجەستە بووە، و لاپەڕەی دەسەڵاتداریەتی پڕ لە شانازی ئەو (کورد) نەخرێتە بەر چاوی دۆست و دژمن!..میللەتێك کە بەردی بناغەی شکۆداری ئێرانی هەوەڵینی بە خوێنی پیرۆزی جەنگاوەرانی خۆی پێکەوە چەسپاندووەو پێغەمبەران و زنجیرە

**پاشاو سەردارانی گەورەو بە ناڤ و دەنگی تێدا هەڵکەوتووە، بێ ئینسافیە لە شانازییە میللەیەکانی خۆی مەحروم بکرێ و میناکی تیرەیەکی ناڤبزر و بێ ناوو نیشان بناسرێت، ئەگەر ئەم نامیلکەیە ئەو پەردە تاریکەی کە بەسەر ئەم راستیانەدا دراوە، لا بردبێ، خۆشحاڵم.**

**ئیحسان نوری پاشا**

((١))

## ڕەگ و ڕیشەی نەژادی

میللەتی کورد لە سەدە دێرینەکانی حەشرو نەشری تیرەی بەشەردا بەشداری کردووە. جڵەوی فەرمانڕەوایی بەشێك لە ئاسیای ناوەندی و ئاسیای رۆژئاوای بە دەست بووە. مێژوو، قارەمانیەتی و دلاوەریو وڵاتگیری ئەم میللەتەی بە هەمان ناوە کۆنەکانی ئەم میللەتەوە تۆمار کردووە.
گەرچی قەڕاڵ لاگاشە ئاداد ناراری، ٢٤٠٠ پ.ز، باسی تیرەی (کاردا)ی کردووە، و (کەمیل سین)ی پاشای ئور، ٢٢٠٠ پ.ز، سەر زەمینی کاردای بەمیرڤردنز سپاردووەو لە ساڵی ١٣٧٠ پ.ز (شوبی لکمبە)ی پاشای هیتت ناوی تیرەیەکی بە ناوی "گوردە" هێناوە. پاش ئەمانەش نووسراوو کەتیبەکانی ئاشوریش ناوی دەشتی کارداو تیرەی کورتیەو کورتی بردووە. ئەگەرچی لە ساڵی ٤٠١ پ.ز گەزنەفۆنی سەردارو مێژوونووسی یونانی و فەرمانـدەی دە هەزارەکە گاڤێ کە لە ئێران دەگەڕایەوە، لە دۆڵەکانی زاخۆدا، نزیکی کێوی جوودی، تووشی میللەتی کاردۆ بووەو پاشاکەیان نێوی ئورونتاس بووە کە بە فارسی

کۆن (ئورونتاسپ)ـە، ئـەمڕۆ بـە "لهراسب" دەخوێندرێتـەوە. لـە سـاڵی ۳۳٤ پ.ز کاتێ ئەسکەندەری مەکدونی هێرشی کردە سـەر ئێـران میللـەتی کاردو لــە ریــزی لەشــکرەکانی داریــوش دا بــووە، (ئارســتوفلس)ی نووســەری ئەسـکەندەرنامە کـە لەگـەڵ ئەسـکەندەر بـووە، دەڵێـت: "کـاتێ دارا بیـستی ئەسکەندەر دێـت، سـی هـەزار سوارەو سـی هـەزار پیـادەی نـاردە ئەوبـەری چۆمی پینـارۆس تـا بـەری لەشـکری مەکدۆنیان بگـرن، بـەو جـۆرە شەسـت هەزار کورداك پشتی مەگدۆنیەکانیان گرت، کورداك تایفەیەکە لـە باشووری دەریاچەی وان دا دەژین." بەڵام میللەتی کوردی ئەمڕۆ تەنیا ئەو کاردۆیانە نـین، بـەڵکو کاردۆکـان، کلیلن بـۆ ناسینی رەچـەڵەك و ناسـنامەی کـوردانی ئەمڕۆ.

بە شێوەیەکی گشتی لە مێژوودا سەر زەمینی کاردۆکان بریتییە لـە دەڤـەری ســەرووی دیجلــەو فــورات و ناوچــەی کێــوی جــوودی. ئارامییــەکان بــەم دەڤـەرەیان گوتــووە کازاتــا، کــاردو. لـە ئیتاڵیـادا، لـە بیـست میلـی بـاکوری رۆژهەڵاتی ناپۆلی شارێك هەیە بە نێوی (کازاراتا).

مێژوونووسانی کۆن دەڵێن گوندی (بقردا) یەکەم گوندەکە پـاش تۆفانەکـەی نوح لە نزیکی جوودی دروستکراوە. بە بەبۆچوونی سـترابوون، بـەو ناوچـە شاخاویەی نێوان موش- دیاربەکر، گوتراوە (کاردۆ). (سـێر مـارك سایس)ش دەڵێت: لە ساڵی شەش سەدی پ.ز، تایفەی (کـوردوین) لـە نێـوان دیاربـەکرو سەرچاوەکانی زێی گەورەدا دەژیان.

هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کە ناوی کێوی جوودی لە نـاوی تایفـەی (گـوتی guti، ژوتی)یەوە هاتووە کە بەر لە مێژوو لەو دەوروبەرە ژیـاون و وشـەکە مانای قارەمان و جەنگاوەری کورد بووە. ئەمڕۆ گەورەترین خێڵی کورد پێی

دەگوترێ کرمانج کە رەنگە لە ناوی (ژوتی)یەوە هاتبێ. بەم پێیە ئەو تایفەیەی کە ناوی بەندە بەکێوی جوودی و گوندی (بقردا) یەکێکە، ئەویش ژوتی، گۆتی بووە.

نووسراوەکان، چالاکی و چەلەنگی گۆتییەکانی لەو ناوچانەی سەرێ ڕا، تا ساڵی سێ هەزارو سەدی پێش ز (٢١٠٠)گەیاندووە. ناوی پاشای گۆتیەکان لەو سەرو بەندەدا (ئانناتوم) بووەو لەگەڵ عیلامیەکاندا شەڕی کردووە. (لوکال زاکیس)ی پاشای گۆتی لە ساڵی دوو هەزار و نۆ سەدی (٢٩٠٠) پ.ز، فەرمانڕەوای ئەرخ و سۆمەر بووە.دکتۆر سپایزەر پێی وایە کە بە گوێرەی ناوە تایبەتیەکانی سۆمەر، رەگەزی گۆتی لە سەردەمانی زۆر کۆندا لە ویلایەتی سۆمەردا ژیاون. (بڕوانە: تاریخ کردو کردستان)، بە بابلیەکانی باشووری دۆڵی دوو روبار و (ئەکەدەکان)ش گوتراوە سۆمەر، لە ساڵی چوار هەزار و پێنج سەدی پێش زایندا، ئەمانە خودانی شارستانیەتی مەزن و خەت و نووسین بوونە. یاسا بە نێوبانگەکەی (حامورابی)ش لە یاسا سۆمەرییەکانەوە وەرگێراوەو مانگە قەمەریەکانیش پاشماوەو یادگاری سۆمەریەکانە.

خەڵکی بابل، کە لە رەگەزو نەژادی جۆراو جۆر بوونە، بە زمانانی جۆراو جۆر قسانیان کردووە. شارستانیەتەکەیان لە سۆمەریەکانەوە وەرگرتووە. رێورەسم و سرووتە ئاینییەکانیان بە زمانی سۆمەری و نووسینیان بە خەتی سۆمەری بووە. ڤادن، کە جاران مامۆستای زانستگەی لەندەن بووە، فەرهەنگێکی بە نێوی (سۆمەریانی ئاری) بڵاو کردوەتەوەو سەلماندوویەتی کە سۆمەریەکانیش ئاری بوونە. (بڕوانە: مجلە ایران کودە) بەم پێیە

ناریەکان بەر لەو مێژووەی کە تا ئێستا زانراوە لە دۆڵی دوو رووباردا هەبوونە.

ناوی سەر زەمینی لولوبیوم، گوتیوم، لە نوسراوو کەتیبەکانی سەردەمی (سارکن)ی پاشای ئاشوریەکاندا (٢٧٠٠ پ.ز) هاتووە. هەر چەندە وا وێنا دەکرێت کە لولوبیەکان باپیرانی لوڕەکان بووبن، لێ لوڕستان بەشێك بووە لە دەڤەری ئەنزان کە دانیشتوانەکانی لە کۆنا کۆسۆکان بوونەو تا دەوروبەری (زایـن)ش لـە شـوێنی خـۆدا بوونـە و دواتـریش کـەس لـەو نـاوەی دەرنەپەڕانـدوون. پاشـتر دیێنـە سـەر ئـەم (کۆسـۆ)یانـە. لولوبیـەکان تـا سـەردەمی (سلم نەسری سێیەم) (٨٢٨پ.ز) دەسـەڵاتیان هـەبوو. دەوڵـەتی ئاشور کۆتایی بە دەسەڵاتیان هێناوە.. ئـەمڕۆ خـەڵکی کرمـانج گـەر بخوازن یەکـدی گـاز بکـەن یـان لـە گفتوگـۆدا یەکـدی بـدوێنن، لـەبری نـاوی بەرانبەرەکەیان وشـەی (لۆلۆ) بـەکار دێـنن. بـەم پێیـە بـەدیار دەکـەوێ کـە بەشێك لـە تایفـەی لولوبیـەکان دەگـەڵ کاردۆکـان دا تێکـەڵ بـوون و ئـەمڕۆ خێڵێك هەن لـە ناوچـەی کرمانـدا، چادرنـشین و کۆچـەرن، پێیـان دەگـوترێ (لۆلۆ).

لوڕ، لـە نـاوی شارێکەوە هـاتووە کـە لـە ناوچـەی رۆژهـەڵاتی دیزفـول بـوود. یاقووتی حەمـەوی دەڵێـت:" لـوڕ خێڵێکـی کـوردە کـە لـە کێوەکـانی نێـوان خوزستان- ئەسفەهاندا نیشتەجێن.

(زبدە التواریخ) دەنووسێت بۆیـە بـە لـوڕ دەڵـێن (لـوڕ) چـونکە لـە ناوچـەی مـانرود، گونـدێك هەیـە بـەناوی (کـورد) کـە لـەو دەوروبـەرەدا دەربەنـدێك هەیە بە شێوە زاری لوڕی (کول)ی پێدەڵێن و لەو دەربەندەدا شوێنێك هەیە

پێی دەوترێ (لوڕ) جا چونکە ئەم جەماعەتە لەو شوێنەوە هاتوون بۆیە پێیان وتراوە (لوڕان).

میللەتی گوتی لە ناوەڕاستی سەدەی بیست و شەشەمی پ.ز، ئەکەد، سۆمەر، عیلامی داگیرکردوە و بۆ ماوەی سەدو بیست ساڵ وچل ڕۆژ لە بابلدا حوکی کردووە. دوایی (ئوتون لوگاڵ)ی پاشای شاری (ئەرخ). (لە باکوری کێوی جوودی دا، لە دەڤەری بۆتان شارێکی کۆن بە ناوی ئەرخ هەیە) کە بە ناوەکەیدا دیارە لە نەژادی گۆتی بووە- لە (تیریکان)ی شاهنشای خۆی هەڵگەڕاتەوەو بەسەریا زاڵ بووە. لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی گۆتی لە باکوری ڕۆژهەڵاتی عیلامدا ویلایەتێك بەنێوی ئەنزان، ئەنشان هاتە ئاراو جیا بووەوە. ئەنزان، بە واتای کوێستانە و بە کوردی زۆزانە. لە سیماشدا (کوێستانی بەختیاری) میرێك جیا بووەوە بە ناوی (گیر). (شوبی لکمبە)ی پاشای هتیت لە کەتیبەکەی خۆیدا دەڵێت ناوی ئەو خوایەی کە کوردەکان gurde، دەیانپەرست ((گیرە)). بەم پێیە دەتوانین بڵێن ناوی خودای دانیشتوانی کوێستانی بەختیاریش (گیر) بووە. میرەکەشیان ناوی خۆی لە ناوی خوایەکەی خۆیەوە وەرگرتووەو لەگەڵ (گوردە)کاندا ڕۆڵەی یەك میللەت بوونە.

چونکە وشەی کاردا پاش تێشکانی تیریکان پەیدا بووە، بۆیە دەشێت بگوترێ لەم دابڕان وپارچە پارچە بوونەدا بەشێك لەو گۆتۆیانەی کە لە دەڤەری سەرووی دیجلە مابوونەوە ناوی کاردایان بە باڵادا بڕاوە، کە ئەکەدو سۆمەرییەکان، قاردەمان، جەنگاوەرو پاڵەوانیان پێ دەگوتن. ئیدی بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار وشەی کاردا گۆڕاو بوو بە غۆردۆ، کۆردۆ.. تا ئەمرۆش کوردێن ئەو ناوچانە بەلاوەکانی خۆیان دەڵێن خوڕتۆ کە دەبێ لە وشەی

(غوردۆ)وه هاتبێ، مێژووی کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگ دەنووسێت:
"توکولتی ئینورتای قەراڵی ئاشوریان لە دوو تابلۆیاندا باسی یەك رووداوی کردووە، کە لە تابلۆیەکیاندا وشەی کوتی و لەوی تریاندا وشەی کورتی بەکار هێناوە، نووسەری کتێبی تیرەکانی میزوپۆتامیا، بە بەڵگە سەلماندوویەتی کە کورد لە نەژادی گۆتیە.
(درافەر)ی رۆژهەڵاتناس رای وایە کە یا کوتی و کورتی هەردووکیان ناوی یەك میللەت بووە یا کورتی بە گەورەترین بەشی گوتییەکان گوتراوە. وشەی کورتی لە سەرەتادا بە هەموو گۆتیەکان نەگوتراوە.
بەڵگەنامەیەك دۆزراوەتەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە بەشێك لە گۆتیەکان تا سەردەمی کوروش، ناوی کۆنی خۆیان پاراستووە. بەڵگەنامەی نێوبراو سەبارەت بە فەتحی بابل لەلایەن کوروشەوە کە لە مێژووی (مشیر الدولە)دا بەمجۆرە هاتووە (ساڵنامەی ساڵی ١٧ نبوئید) نووسیویەتی کە (ئوگبارو-ugbaru)ی والی گۆتییەکان بە قۆشەنەکەیەوە دای بەسەر بابلداو نبوئید لە لایەن کاندیشەوە لە بابل یەخسیر بووە، ئەوجا سوپای ئێران داخڵی بابل بووە. تا کۆتایی مانگ دەروازەی پەرستگەی ئەساهیل، واتە ماڵی گەورەی مەردوك لە ئابلۆقەی گۆتیەکاندا بووە.
تاقە نێزەیەك نەبرایە ناو ئەم شوێنە پیرۆزە، ئاڵاو بەیداخێك نەبرایە ئەوێ. لە سێیەمی هەیڤی مرهش وان -مانگی بابلییە- کوروش بەخۆی چووە نێو شارو ئەمن و ئاسایشی بەرقەرار کرد و (ئوگبارو)ی کرد بە والی ئەوێندەر. ئوگبارو لە شەوی یازدەی (مرهش وان)دا چووە شەڕو کوڕی پاشای کوشت -لە ٢٧ ئازەرەوە تا سێی نیسان- ئەکەد لە پرسەدا بوو. وەکو دەردەکەوێ چۆن باپیرانی کورد نەینەوایان فەتح کرد. بەو جۆرەش یەکەم

تایفـه کـه بـه زەبـری شمـشێر چـوونه بابلـەوەو پاشـاکەیان یەخـسیر کـرد، گۆتیـەکان بوونـه. میـژوو، شـانازی فـەتحی (بابـل)یـشی بـەنێوی بـاپیرانی کــوردەوە تۆمــار کــردووە. لــە کــاتی روخــانی بابلــدا دوو راگەیانــدن بلاوبووبوونەوە کە دیارە کاهینە رۆحانیەکان لـە یـەکێك لـەو راگەیاندانـەدا (اعلامیــە) دەڵــێن: "چــونکە پاشــای بابــل کەمتەرخــەمی دەرهــەق بــە (مەردوك)ی پاشای خودایان کردووە، ئەویش کوروشی بە دادپەروەر زانیوەو داوای لێکــردووە حــوکمی دنیــا بکــات و گۆتیــەکان و (ئومانمانــد)ەکــانی خستونەتە ژێر پێی ئەو. بابلییەکان بـە خـەڵکانێکیان گوتـووە (ئومانمانـدا) کە خاکەکەیان لە عیلامەوە تا دەریای رەش بووە.

لە سەدەکانی پاشتردا ئیدی ناوی گۆتیەکان نەماوە، لە هەموو شـوێنێ بـووە بـە کاردا، کورتی، کوس. کتێبـی (مێـژووی ئـەدەبی کـوردی) کـە بـە زمـانی کوردیە، دەنووسێت: "دکتۆر کونتیناف دەڵێت: لە هەزارەی چوارەمی پـێش. زدا، خـەڵکانێك لـە دەشـتەکانی باشـوری سیبیریاو روسـیاوە بـۆ کۆسـارەکانی زاگرۆس کۆچیان کردووە و جێ گۆرکێیان کردووە، بەوانە دەڵێن ئاریاییـك یان ئاسیایی. لە ساڵی سێ هەزاری پێشز (پێشز= پێش زاین) دەستەی دووەم لە هەمان شوێنەوە کۆچیان کـردووە و گەییونەتـە کێوەکـانی زاگـرۆس، کـە زانایان، ئاری یا هندو ئەوروپاییان پێگوتون. هەردوو دەستەکە پاش پێکادان و شـەڕو شـۆڕ، تێکـەڵاوی یـەکتر بـوون و میزوپـوتامیـان داگـیر کـردووە، کـە ئەوانە بە (گوتی، کوسی) ناسـراون. لـە شـوێنێکی دیـدا بـە گـوێرەی بـاوەری ئـوجین پیتــار ســولاك، فــون لوشــان دیــسان دەنووســێت: "بەشـێك لــەو ئاریاییانەی کە لە تورکستانی ئەمڕۆی شورەوی کۆبووبوونـەوە رویـان کـردە باشــوری ئێــران و لێــرەدا بــوون بــەدوو بەشــەوە.بەشـێکیان رویــان کــردە

کێوەکانی هەمالایاو بۆ هیندوستان چوون و میللەتی هیندیان لێکەوتەوەو بەشێکی تری لە ئێراندا مایەوەو ناوی ئێرانییان گرتەخۆ. دوور نیە لە ساڵی دوو هەزارو پێنج سەدی پێش زایندا هاتبنە ئێران. بەشێك لەمانە لە دەشتدا مانەوەو بوون بە فارس. بەشێکی تریان رویان کردە چیاکانی زاگروس، بە تایفە و تیرەی میناکی: لولو، گوتی کوسی، مانای، کاردوش، خالدی، کاردۆ، ناویان دەرکردو ناسران.

هەر چەند بە گوێرەی باوەڕو بۆچوونی ئەم زانایانەش یەك ئاکام و ئامانج بە دەست دێ، ئەویش ئەوەیە کە تایفەو تیرەکانی زاگرۆس بە گشتی لە یەك نەژاد بوون و هۆزو تیرەی یەك میللەتی ئاریایی بوونە.. بەڵام ناوی میللەتێك کە بەر لە گۆتیەکان لەم دەڤەرو قەڵەمرەوەدا ژیا بێ، هێشتا ئاشکرا نەبووە. ئەو حەفریات و پشکنین و دۆزینەوانەی لەو ناوچانەدا کراوە، شوێنەواری هیچ میللەتێکی کۆنتر لە گۆتیەکانی بۆ نەدۆزرایتەوە. بەم پێیە بێ کە دکتۆر سپایزەر، مێژووی مادەکان لە کۆجاڕەکانی زاگرۆسدا دەگێرێتەوە بۆ شەش هەزار ساڵ پێشز و ئاماژەی بۆ گۆتی بوونیانیش کردووە، ئەمە پشتیوانی لە بۆچوونەکانی (بروس)ی مێژوونووس و پێشەوای کلدانی دەکات –کە لە سەدەی سێیەمی پ.ز ژیاوە- دەربارەی باسی نەژادی (زەردەشت) کە ئەم پێغەمبەرە دەباتەوە سەر ڕەگو ڕەچەڵەکی ماد نەژادان و بەمادی دەزانێت کە لە ساڵانی ۳۰۰۰- ۲۳۰۰پ.ز لە کلدەدا حوکمڕانیان کردووە.

لە راستیدا گۆتیەکان بوونە کە لەو سەدانەدا، لە دەوروبەری کلدە شەڕو شۆڕیان کردووەو ناوە ناوە حوکمڕانیان کردووە. هەر لەبەر ئەمەشە هەندێ کەس بە هەڵە ئەم تیرەیە بە کلدانی دەزانن، بە هۆی ناوە تایبەتیەکانی

گۆتیەکانەوە. هەمو توێژەرو لێکۆڵەرەکان لەسەر ئەو رایەن کە گۆتیەکان سامی نەژاد نین، بەڵکو بە تێکەڵەیەکی ئازیاییك و ئارییان ناسیون — ئازیاییك بەو تیرانە گوتراوە کە لە کۆنا لە بنارو قەد پاڵەکانی زاگرۆسدا ژیاون و سامی نەژاد نە بوونە. سەرباری ئەو بۆچوونانەی سەرێی رۆژهەڵاتناسەکان، کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەکی وردتر هەیە، ئەوە دەسەلێنێ کە گۆتیەکان کۆنترین نەژادی ئاریایی بوونە. کتێبی (ادبیات مزد یسنا پشت ها) کە لەلایەن مامۆستای بەڕێزی زانستگەو پسپۆڕی زمانی زەند —ئاویستا، و سەرۆکی کۆڕی ئێران ناسی، جەنابی (أ- پور داود)ەوە دانراوە لە (فەروەردین پشت)ی کتێبی پیرۆزی ئاوێستاوە هەندێ شتی وەرگرتووەو تەرجەمەی کردووەو باسێکی لەمەڕ ناوی(گیوتمە) نووسیوە. بەپێی ئەم باسە بێ، یەکێك لە خەنیم و نەیارەکانی زەردەشت ناوی (گیوتمە) بووە، لە سانسکریتیشدا بەچینی سروود بێژان وتراوە (ڤیدا گیوتمە). ناوی دامەزرێنەری ئاینی (بودایی)ش هەر گوتمەیە.

بە بۆچوونی من،وشەی (گۆتی) لە (گیوتی)یەوە هاتووەو بە مەعنای گاپ هاتووە، جەنابی پورداود لە کتێبی گاتاکانی زەردەشتدا دەنووسێت: "گیوش اوروان -ئێستا گوش گوئیم-ە چواردەمین رۆژی هەر مانگێ بە نیگابانی ئەم فریشتەیە دەسپێردرێت. لە ئاوێستادا گیوش اوروان، رۆحی یەکەم ئافەریدەی ئاهورا مەزدایە —مەبەست گاب"ـە، ئەمەی کە (گوش)ی پێدەگوترێ، کوسی یە، وەکو چۆن گیوش لە فۆنەتیکا گوش، کوسییە.(گیوتە)ی ئاوێستاش گوتی بووە کە لەگەڵ گیوشەدا یەکەو بە مەعنای (گاب)ـە.(ئەشپیکل)ی رۆژهەڵاتناس وتوێژەری بە نێوبانگ لە تەرجەمەی ئاوێستاکەی خۆیدا، فەقەرە شازدەی (فەروەردین پشت)

گیوتمەی بە ناوی تایبەتی –بەمانای جووتیار- نەزانیوەو بە مانای تیرەو قەبیلە تەرجەمەی کردووە. یوسنی پاش ئەوەی کە گیوتمەی بە یەکێك لە دژمنەکانی مزدیسنا ناو بردووە، ئەگەری ئەوەی داوە کە وشەی نێو براو لە بنەڕەتدا ناوی رەگەز بێ نەك ناوی تایبەتی، (بڕوانە: ادبیات مزدیسنا یشتها، از تألیفات جناب پور داود). ئەم زانایانە وشەی گیوتمەیان بە ناوی قەبیلەو تیرەیەك زانیوە. بەڵام لە بەرە بەیانی مێژووەوە تا سەردەمی ئاوێستا غەیرمز گۆتی چ تایفەیەکی دی بەم ناوە لە نیشتمانی زەردەشت و دەوروبەریا نەبووە. ئاشوریەکان بەم تایفەیەیان دەوت گوتیوم، بەم پێیە دەشێت گیوتمەی ئاوێستا بە گۆتی بزانین.

حەزرەتی (بودا) لە نزیکی سنووری باشووری نیپال لە دایك بووە. بابی لە میرەکانی (سوهودان)و لە تیرەی (سکیا) بووە. هەندێك ناوە ئەسڵەکەی بە سیدهیتا و شۆرەتەکەی بە گیوتمە دەزانن. (چونکە لە سەردەمی هۆشەنکێشییەکەی داریوش بۆ سەر تراکیا، ناوی تیرەو تایفەکانی گوت و بودین لە نێو سکیاکاندا بەرچاو دەکەوێ و لە گینە قەبیلەی (سکیا)، (سکا)کان بوو بێ. بە هەر حاڵ وشەی گیوتمە، گیوتە، وگوت کە لە بنچینەدا لەگەڵ گۆتیدا یەکن، لە نێو ناوە ئارياييەکاندا بەرچاو دەکەوێ!...

وا دەردەکەوێ، گۆتییەکان بانگەوازەکەی حەزرەتی زەردەشتیان قەبوڵ نەکردووەو بە نەیارو رەقیبی زەردەشت ناسراون، زەردەشت ناچار بووە روو بکاتە رۆژهەڵات و بۆ ئەوێندەر کۆچ بکات... سەرباری ئەمەش:

١ لە شوێنەوارە کۆنەکانی بابلدا ستایشی کەنیزەکە گۆتی نەژادەکان کراوەو پێیان گوتراوە (مامروتی)، رەشید یاسەمی رەحمەتی پێی وایە لەم بارەیەوە جیاوازی تەواویان لەگەڵ زوانی سومەری و ئەکەدی هەبووە.

دەشێت بگوترێ هەردوو وشەی (مامرو)و (ماهرو) زۆر لێکدی دەچن و یەك مانایان هەیە.

٢- لە نێو پاشایانی گۆتیدا ناوی (شورلك، لاسیراب، تیریکان) دەبینین کە دەشێت ئەو ناوانە بە ئاریایی بزانرێن.

بۆ نموونە ناوی (شەڕلك) کە بەشی یەکەمی (شەڕ)ـە لەگەڵ وشەی (گەڕ)ی فەرەنسیدا یەکەو هەرتکیان بە مانای (جەنگ) دێن. میللەتی کورد تا ئەمڕۆش بە جەنگ دەڵێن (شەڕ)، (لك) بە مانای سەد هەزارەو لەزوانە ئاریاییەکانی هیندی و کوردیدا باوە. لە سەردەمی دەوڵەتی سالارییەدا کە بریتی بوو لە کوردە دەیلەمیەکان، ناوی هەندێ لە سەردارەکانیان (شەڕمەزن) بوو کە ئەویش مانای (شەڕلك) دەگەیەنێ و زاراوەیەکی کوردیە و بە مانای شەڕی گەورەیە.

(مەزن) لە (مها)ی سانکسریتیەوە هاتووە، لە ئاوێستادا بووە بە (مازا) و لە کوردی ئەمڕۆدا بووە بە (مەزن) کە بە مانای گەورەیە. نیشانەی ئاریایی بوون لە ناوانی (لاسیراب، تیریکان)شدا ئاشکرایە و لە سەردەمی ساسانیەکاندا بە جەژنی (تیرماه) گوتراوە (تیریگان).

٣- لە سەردەمی نارامسیندا، (پوتی مادال)ی فەرمانڕەوای (نمر) دژمنایەتی ئەکەدییەکانی دەکرد. وەکو چۆن فەرەنسییەکان بە بچووك دەڵێن (پوتی) کوردی باکووریش بە کیژی بچووك دەڵێن: "پتی Piti" کە وشەیەکی ئاریایی کۆنە. بە چ مەعلوم لە وشەی (پوتی مادال)دا بەشی یەکەمەکەی (پوتی) بە مانای بچووك نەبێ، و بەشی دووەمەکەی (مادال) بە مانای (ماترا) نەبێ، و (ماترا) ناوی یەکێك لە خودایانی ئاریایی کۆن نەبێ کە (پوتی مادال) بە مانای خوای بچووك بووبێ. لێرەدا جێی خۆیەتی

وشەی (نەمرود) لەگەڵ (نەمر)و خوای بچووکدا بەراورد بکرێ... ئەم بەشە لە کۆتایی کتێبەکەدا بە درێژی باسکراوە بۆیە لێرەدا چیتر لەسەری ناڕۆین. وشەی (نەمر) لەگەڵ نەمری ئێرانی ئەمڕۆدا یەکێکە و کوردەکان لە پاڵ وشەی (زیندوو)دا (نەمر)یش بەکار دێنن.

٤- لە زاگرۆسدا پاشایەك هەبووە بە نێوی (ئاریزن) و ئەم (ئاریزن)ـە هیچ جیاوازیەکی دەگەڵ وشەی (ئاریزانت)دا کە نێوی تایفەیەکی ماد بووە نییە.

٥- لە سەدەی بیست و پێنجەمی پێش زایندا، ناوی پاشای ئەرخ، (ئوتون لوگال) بووە. لە ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆیەمی زایینیدا، پاشای ئەڵمان، ناوی (ئوتون) بووە. (ئوتون)ی دووەم لە ساڵی ٩٨٢دا، (تیوفانو)ی کیژی ئیمپراتۆری رۆمی خواست. بەم لێکچونانەدا دەبێ ئەوەمان قەبوڵ بێ کە ئەو وشانە ئاریایی بوونەو ئەو تیرەو هۆزانەی ئەم ناوانەیان تێدا بووە هاو خاك، هاوسێ، هاو نەژاد و تەنانەت خودی گۆتییەکان بوونە کە وشەی ئاریاییان بە کار هێناوە، واتە لە نەژادی ئاری بوونە.

پاشان لە هەندێ شوێنی نیشتمانی گۆتیەکاندا، کۆسیەکان لە مەیدانی سیاسەتی میزوپوتامیادا خۆیان نواندووە، ناوی خواوەندان و پاشایانی کوسی بە زۆری ئاریایی بووە.

پاشای لولوبی (ئانوبانی نی)ی پاش تێپەڕ بوونی رۆژگار بە ئانقەست پاشای گوتی بە میری (کوپە) ژماردووە، لەمەوە وا بە دیار دەکەوێ کە لەگینە (گوتی) بە تێپەڕ بوونی زەمان لە هەندێ شوێنا بووبێ بە (کوپی، کاسی، کسی). لە راستیا لەو سەروبەندانەدا کە گۆتیەکان لە زاگرۆس‌و ئەنزاندا بوون، بە باکووری عیلام گوتراوە (کاشن) کە لە بنەڕەتدا کاسییە.

(هرتسفلد)ی توێژەری ئەڵەمانی دەڵێت دەریای خەزەر کە ناوە ئەوروپاییەکەی (کاسپین)ە، لەناوی تایفەیەکەوە هاتووە کە بەر لە مێژوو، لە ڕۆژاواو باشووری ئەم دەریایەدا دەژیان و ناوی (کوسی، کاسو، کسی) بوو، چونکە کۆی وشەی کاسو: (کاسپ، کسپ، کسپین)ە، بۆیە ئەم ناودش لە دەریای خەزەر نراوە، بە باوەڕی هرتسفلد تەنانەت ناوی (قەزوین)ش لە (کسپین)ەوە هاتووە. (بڕوانە: ایران باستان).

بە گوێرەی نێوەڕۆکی گاتاکانی زەردەشت کە لە لاپەڕەکانی پێشترا باسم کردووە، ئەم وشەی کوسیە کە لە مێژووی فارسی و عەرەبیدا بە هۆزی کوسی مەنشورە (بڕوانە: کرد، پیوستگی نژادی و تاریخی او) لە ئاوێستادا بە شێوەی گیوش و بە واتای گاب هاتووە کە دەگەڵ (گوتە، گیوتمە، گوتمە)دا یەك مەعنایان هەیە، و ناوی یەك میللەت بووە. لە شێوەزاری ناوچە جیاوازەکانا (کیوتە، گیوشە) بە شێوەی (گوتی، گوش، کوسی) تەلەفوز کراون.

ناوی گوتی لە شوێنەوارە کۆنەکانی ئەکەدو ئاشورشدا هاتووە، کە ڕاویانی ئەم نووسینانە نەگەییونەتە کۆجاڕەکانی دەریای خەزەر، دەنا لەوە بوو لەوێندەریش ناوی (گوتی)یان هێنابوایە، بۆ وێنە لە ناوچەی (وەزیر)ی ئەفغانستاندا، کە نزیکی سنووری هندستانە تایفەیەك هەیە بە ناوی (پیر گوتی). هەندێ لێکۆڵەرەوە دەڵێن: بەشێك لە تیرەکانی هندو ـئەوروپایی دوو هەزار ساڵ پ.ز لە دەشتەکانی تورکستان و سارای باکووری قەوقاز و دەریای خەزەرەوە کۆچیان کردووە و هاتوونەتە ئێران و نزیکی ناوچەکانی (کاسو) بوونەتەوە و لەگەڵ ئەو تیرەیەدا تێکەڵ بوون.. مسیو (ئاندرکدا) بەڕێوەبەری گشتی دایەرەی موزەخانەی ئێران وتارێکی لە ژێر سەر نافی

(حفریات علمی در ایران) داوه به ساڵنامەی پارس ١٣١٠، لەم وتارەدا دەڵێت:
"ئەو شتانەی لە لورستاندا، لە بن عاردی دەرهێنراون، کێونشینانێك دروستیان کردووە کە لە سەردەمانێکی نەدیاردا لە کێوەکانی خەزەردا ژیاون و پاشان لە ئاکامی هێرش و پەلاماری تیرەو تایفەی دیکەوە، کە لە باکوورەوە هاتوون، ئەوێیان بەجێ هێشتووەو نزیکەی چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر چوونەتە لورستان و لە مێژوودا بە کاسیت ناسراون. ئەم هۆزە، بابلی داگیر کردو نزیکەی شەش سەدە فەرمانڕەوایی ئەو هەرێمەی کردووە، پاشان هاتۆتەوە زۆزانەکانی خۆی و سەر قاڵی ماڵات بەخێو کردن و بازرگانی ئەسپ بووە. ئەسپیان بە هێزی سوارەی ئاشوریان دەفرۆشت و سەروەت و سامانێکی باشیان لەم بازرگانیە وەدەست دەهێنا. ئەو شتانەی دۆزراونەتەوە بریتین لە شتی برونزی بەنرخ، لە ئامێری جەنگ و لغاوی ئەسپ و جەواهێرات و هیربارو ئامانی گڵین و هەر هەموو ئەمانە نیشانەی زەوقی پیشەسازی و لێهاتوویی هونەری ئەو هۆزەن و یادگاری سەرکەوتن و سامانی ئەون. نێوبراو بەم لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەیە بۆچوونەکەی هرتسفلد دەسەلێنێ.. بەم پێیە تایفەی هیندو ئەوروپایی کە لە جێی خۆ جولاون، هاتوونەتە لورستان، شوێنە کۆنەکەیان هاوسنووری باکوری ئێران بوووە. بە گوێرەی قسەی هرتسفلد هەر لە هەوەڵەوە ناویان کوسی بووە. واتە لەگەڵ دانیشتوانی باکووری ئێرانا هاوناو بوونەو بە گوێرەی هاوناوی و نزیکیان لە یەکدییەوە، هاوزمان و هاو نەژادیش بوونە.

دەربارەی جیاوازی زوانی دانیشتوانی ئێرانی رۆژاواو دەریای خەزەری هەزارەی چوارەم لەگەڵ هەزارەی سێیەم و دووەمی پ.ز، دەبێ ئەوە وەبیر بهێنرێتەوە کە زمانی ئێرانی سەردەمی (هەخامەنشیەکان) لەگەڵ زمانی

**سەردەمی ساسانیەکان و زمانی ئێرانی سەردەمی ساسانیەکان لەگەڵ زمانی ئێرانی ئەمڕۆدا چ جیاوازیەکی گەورەیان هەیە؟!...**

لە کاتێکدا کە لەو سەدانەدا کتێب و نووسراوان هۆی پاراستنی وشەو زمان بوون، کەم و زۆر رەواجی هەبووە. لێ بە پێچەوانەوە لە هەزارەی سێیەم ودووەمی پێش زایندا تیرەو هۆزەکانی زاگرۆس لەم نیعمەتە بێ بەش بوون، بۆیە ئەگەر زمانی گۆتی، کۆسی کە نوێنەرو سەر قافڵەی زمانی تیرە بچووك، هاوسێ، هاو خاکەکانی خۆی بووە. یانی ئەو تیرانەی کە بە ئازیاییك ناسراون، بە زمانی سەرەتای (ئارییەکان) قەبوڵ بکەین، ئەوا بە هەڵەدا نەچووین! دەستەکانی پاشتر کە گەیپونەتە کێوەکانی زاگرۆس و هەندێ شتی تازەیان هێناوەتە ناو زمانەکەوە، لەبەر ئەوەی بەگشتی سەر بە یەك نەژاد بوونە بە ئاسانی تێکەڵی یەکتر بوونەو لە ماوەیەکی کەمدا یەکێتیی خۆیان سەلماندووە. دەربارەی ئاڵوگۆڕەکانی زمان بڕوانە وتاری (ژیانی زمان)ی مامۆستا رەشید یاسمی کە لە ژمارە نۆی گۆڤاری (ئێرانی ئەمڕۆ)دا بڵاوبووەتەوە. جگە لەمانە رۆژهەڵاتناسان، یەکەم شوێنی تایفەی گەورەی ئاریایی (کورتی)یەکان بە رۆژهەڵاتی ئێران دەزانن و دەڵێن یەکەم بەشی ئەو تایفەیە کە هاتوونەتە رۆژاوای ئێران (ساکارتیەکان) بوونە کە ئاشوریەکان (زاگروتی)یان پێدەگوتن و تەنانەت (توکولتی ئینورتا)ی پاشای ئاشور بە گوتیەکانی هاوسێی خۆی گوتووە (کورتی).

دەربارەی بوون و کەسایەتی (گۆتییەکان) نووسراوی پاشاکانی ئاشور باشترین و بە متمانەترین زانیارین کە تا ئێستا بە دەست کەوتوون. بەم پێیە چ گومانێك لەوە نامێنێ کە وشەی (کورتی) لە (گوتی)یەوە هاتووەو بە بالای گەورەترین بەشی (گۆتییەکان)دا بڕاوە. ئەگەر پشت بە قسەی

رۆژهەڵاتناسەکان ببەستین، ئەوا دەبێ ئەوەمان قبوڵ بێ کە نیشتمانی (گۆتی)یەکان تاکو رۆژهەڵاتی ئێران هاتووەو پاشان بەشێك لە (کورتی)یەکان لە وێندەرەوە بەرەو رۆژاوا هاتوون و چوونەتە نێو (کورتی)یەکانی رۆژاوای ئێران و باکووری میزوپوتامیا و گومانی تێدا نیە کە زمانی (کورتی) یەکانی رۆژئاواش لە ئاکامدا هەندێ گۆڕانی بەسەر هاتووە... بەشێك لەم کورتیانە لە رۆژهەڵاتی ئێران و باشووری دەریای خەزەر ماونەتەوە کە لە سەدەکانی دواترا بە هەندێکیان گوتراوە (کورتی، کورد) لەو ناوچانە بوونە. ئەبو موسلیمی خۆراسانی نێودار لەو کوردانەی رۆژهەڵاتی ئێران بووە.

بەشێك لەو (گۆتی)یانەی کە زوو لە باکوری عیلام دەژیان لەو (گوتی)یانە بوونە کە سەردەمانێك لە عیلامەوە تا کێوی (ئامانوس)یان —دەکەوێتە ناوچەی ئاتنەی کەناری دەریای مدیترانەوە- داگیر کردووەو لەو ناوچە بەرینەدا حکومەتیان هەبووە. ئەوانەی کە لە کۆسارەکانی باکوری عیلامدا نیشتەجێ بوون، پاشان دەوڵەتێکی سەربەخۆیان دامەزراند بوو بە نێوی ئەنزان یا ئەنشان.

لە قەڵەمڕەوی بەختیاری، لە ناوچەی مالامیر، (مالامیر: وشەیەکی کوردیە یانی ماڵی میر یا موڵکی میر) و کول فرە، (کول فرە: وشەیەکی کوردیە واتە فراوان) و لە شکەفتی سلێمان (شکەفت: وشەیەکی کوردیە، یانی ئەشکەوت و غار) هەندێ بەردەنووس و کەتیبە دۆزراونەتەوە کە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەکانی دوانزە و سیانزەی پ.ز، لە پاش (تخی خی کوتوا مارد)ی پاشای (خنی) بە جێماون و خۆی بە پاشای ئەنزان لە قەڵەم داوە.

لەو سەردەمەدا کە کوسیەکان ئەستێرەیان دابوویە کزی، پاشای ئەنزان دیسان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە شوێنی کوسیەکانی خستوەتە ژێر رکێفی خۆی و گوتی و ئەماردیەکان کە تایفەیەکی کورد بوونە، لە سایەی ئەودا بوونە. ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە دانیشتوانی ئەنزان گوتی بوونەو کوسی و گوتی هیچ جیاوازییەکیان نەبووەو یەك میللەت بوونە.

لە سەردەمی ئەکەدو سۆمەرو ئاشوردا، زۆر ناوی تیرەو هۆزی غەیرە سامی لە کۆجاڕەکانی زاگرۆس و بناری ئەو ناوچەیە و پێکادانی ئەو تیرەو هۆزانە نیشانەی بوونی نەژادی جۆراو جۆرو جیاواز نییە، لە راستیدا نابێت ئەو تیرەو هۆزانە لە گۆتی و کوسیەکان جیابکرێنەوەو بە جیا بزانرێن.

لەو سەرو بەندەدا کە مەیدانی نێوان کێوەکانی زاگرۆس و کێوی ئامانوس لە ژێر دەستی گۆتییەکان بووە، لە هەمان شوێندا (سوباریەکان) هاتوونە مەیدان و سنووریان لە باکووری عیلامەوە تا چیای ئامانۆس دیاریکراوە. نارامسین بە (سوبارتیم)ی ناسیون. ئەم سۆبارییانە تایفەیەك بوونە لە گوتییەکان. تەنانەت هەندێ لێکۆڵەرەوە (سوباری)یان بە پایتەختی گۆتیەکان زانیوەو هەندێکی دی (سوباری)یان بە شوێنی جوگرافیایی گۆتییەکان زانیوە. پاشان هەر لە هەمان ناوچەدا (نایریەکان) رەونەقیان پەیدا کردووەو سەرچاوەی دیجلەو فورات و نێوان چیاکانی نەتلیس-توروس)یان گرتووە. بەپێی نێوەڕۆکی کتێبی (کارنامە ایرانیان در عصر اشکانیان) پاشایانی (ئورارتو)ش بە خۆیان گوتووە پاشای نایری. زۆر لەگینە ئەم پاشایانە لە (نەمر، نەمری)یەکانی کۆن بن کە لە سەرێرا باسمان کردوون. ناوی نەهری (ناوچەی شەمدینان) پاشماوەی ئەم هۆزەیە. ئەم (نایری)انەش لە هۆزی گوتی و سوبارییەکان بوونە. لە کتێبی مێژووی

ئەدەبی کوردیدا، لاپەڕە بیست و دوو، نووسراوە: "مێجەر سۆن" دەڵێ:
ئەگەر چاوێ بە سەردەمی گۆتیەکانی نێوان سەدەی یازدەو دوازدەی پێش زایندا بگێڕین سەیر دەکەین کە ئەم (نایری)یانە -کە پێش میدیەکان بوونە- لە کوردستاندا ژیانێکی خۆشیان هەبووەو ترسیان خستۆتە دڵی دراوسێکانیانەوە. هەر ئەم قەومەیە کە پاشان ناوی گۆڕاوەو بووە بە کورد. لە راستیدا چونکە (نایریەکان) لە گۆتیەکان بوونەو گوتیەکانی ئەم ناوچەیەش کە پاشان بوونە بە کورتی، پاش لە ناوچوونی دەسەڵاتی نایریەکان ئەم تایفەیە بە ناوی خۆیانەوە (کورتی) ماونەتەوە. بێگومان تا ماوەیەك میناکی کرمانج، کەلهوڕ، لوڕ، ناوی قەبیلەیی خۆی پاراستووە.
لە ساڵی هەزارو سەدو پەنجای پێش زایندا، تایفەی موشکی دەسەڵاتیان پەیدا کردووەو ناوچەی کوردستانی باکووریان خستوەتە ژێر دەسەڵات و رکێفی خۆیانەوە و لە ساڵی هەزارو سەدی پێش زایندا، (قوبادو کیە و کلیکیا)شیان داگیر کردووە. (قوباد و کیە) لە کۆنا (کپودو کیەو یاکات پتو) بووە. خەرپوت، ئاتنەی بەشی باکووری حەڵەب، بەشی خواروی سیواس، قۆنیە لە باشوورو کیلکیە لە باکوورو پانت‌ی گرتبووەوە. شاری (موش)ی ئەمڕۆکە ناوەکەی لە ناوی تایفەی نێو براوەوە وەرگرتووە. لە سەدەی هەشتەمی پێش ز، میداس ناوێك لە (لدیە) دەسەڵاتی گرتووەتە دەست و لە مێژوودا بە (میتای موشکی)ش ناو براوە. ئەمەش بەڵگەی یەکبوونی میتان و موشکیەکانەو بەڵگەی ئەوەیە دەسەڵاتیان لە (لدیە) هەبووە. پاش نایری و موشکیەکان، ئاراراتیەکان لە باکووردا ناویان پەیدا کردو لولوبیەکان لە باشووردا لە مێژ بوو دەوڵەتی ناوچەیی و سەربەخۆیان دامەزراندبوو. حوکمڕانانی ئاشوری لە سەدەی نۆزدەو هەژدەی پ.ز، لە تیرەی لولوبیەکان

بوونـە. لولوبیـەکان سـەردەمانێ لـە سـوریا ژیـاون. پاشـایەکی لولـوبی نـاوی (ئیماش گوش) بووە کە گوش ناوێکی دیکـەی کوسـیە. بـەم پێیـە ئـەم تـیرەو هۆزانە: مانئائی، میتانی، پارتواو مادەکان کە قەفقازو کـەناری دەریـای ڕەش تا شوشی ڕۆژهەڵاتی ئێران و تا ئاتنە دەڤەرێکی شاخاوین گرتبوو، بەگوتەی ئـوجین پیتـار سـولاك و فـون لوشـان، کـە بـاوەڕی وان لـە مێـژووی ئـەدەبی کوردیەوە وەرگیراوەو لەسەرێڕا نووسـراوە، خـەڵکانی سـەر بـە یـەك میللـەت بوونە، کە باب و باپیرانیان لە سەردەمێکی نەدیاردا ناوچەکانی نێو براویـان داگیر کردووە. ئەو بەشەیان کە لە قەفقازو ڕۆژهـەڵاتی ئێـران و ڕۆژهـەڵاتی دەریای ڕەشـدا بـوون، خۆیـان لەبـەر پـەلاماری تـیرەو هـۆزی دی نـەگرتووەو ڕوویـان کردووەتـە نێـو هاو نـەژادەکانی خۆیـان لـە کۆجارەکـانی زاگـروس و نیفاتـسدا (نیفـاتس: ناوچـەی دیاربـەکر، خویفـت و دەرسـیم دەگرێتـەوە.) هەندێ جار تیرەیەکیان هێزی پەیدا کردووەو لـە بـەردەم پـەلامارو هێرشـی دوژمنی بێگانەدا وەستاون و یارمەتی یەکتریان داوە.

کوسیەکان، گافێ کە هێرشیان کردە سەر بابل، نموونەی هاوکاری عەشـایەری گوتی و لولو بوون. لە سەردەمی ئەکەدییەکاندا، ئەکەدیان خـاکی (لولـو)یـان داگـیر کردبـوو. لەشـکری گۆتیـان، ئەکەدیـەکانی تـەفرو تونـا کـردو لولوکـان جـارەکی دی سـەربەخۆیی خۆیـان بـە دەسـت هێنایـەوە. بـەپێی نووسـراوی ئادادنیراری، پاشـای ئاشـور لەگـەڵ لەشـکری کاسـی، گـوتی، لولـوم و سـوباریدا جـەنگیوەو زاڵ بـووە بەسـەریاندا و هـەر ئـەم پاشـایەیە کـە بـە گۆتیـەکانی گوتووە کۆتی.

پاشایانی ئاشـور، بـۆ وەی خۆیـان بـە توانـاتر نیـشان بـدەن، کـە لـە شـەڕێکدا شکابان، ئیدی ئەو شەڕەیان لە نووسـراوەکانیاندا وا تۆمـار دەکـرد کـە گوایـە

نیایدا سەرکەوتوو بوونە. بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە گۆڤاری (ایران کودە، شمارە ٨) کە ڕوونکردنەوەو نموونەی پتری داوە. ئێمە کارمان بە دروستی یا نادروستی ئەم نووسراوانەی پاشایانی ئاشور نییە. ئەوەی بەلای ئێمەوە مەبەستە، ناوی تیرەو کەس و ناوی شوێن و مێژووی تەقریبی ڕووداوەکانە.
کە دەوڵەتی بابی بە یەکجارەکی بە دەستی کوروش لە بەین چوو گوتیەکانیش چوونە هیمدادی ئیرانیەکان و لەشکری گوتی، بابلی فەتح کردو (نبوئید)ی پاشای بابل بە دەستی وان دیل بوو.
لە هەموو ئەمانە خۆیاتر ئەوەیە کە بەڵگەیەکی مێژوویی ئەوە دەسەلمێنێ کە ناوی گشتی تیرەی خالدییەکان -ئاراراتیەکان- سوباری، نایری، میتان، موشکی و... هتد. گۆتی بووە. ئەم بەڵگەنامەیەش بەردەنووسێکی (کەتیبە) "سلم نصری یەکەم"ـە کە لەمێژووی (کوردو کوردستان) وەکو خۆی وەرگیراوەو بەم جۆرەی خوارەوە تەرجەمە کراوە. ئەم پاشایە لە ساڵانی ١٢٨٠ ١٢٦١ پ.ز حوکمڕانی کردووە. لە کەتیبەکەدا نووسراوە: "قەومی گۆتی کە لە ئاسمانی ئەم سەردەمەدا وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە نەك هەر بە زۆری ژمارە، بەڵکو بە عەزم و جەزم و توندو تیژی و وێرانکاریش مەنشور بوو، بەرانبەر بەمن درێژەیان بەیاخی بوون و دژمنایەتی خۆدا".
پاش جەنگەکە پێیان دەڵێت: "لە سنووری ئاراراتەوە تا کەموخی -تورعابدین- لە نێو ئەم وڵاتە گەورەیەدا خوێنی گوتی وەکو ئاو ڕژاوە".
نووسەری گرانقدری مێژووی (کوردو کوردستان) ئەمین زەکی بەگی ڕەحمەتی دەنووسێت: "لەمەوە وا دەردەکەوێ کە دەفەری یاخیبوونی هۆزی گۆتی لە ئاراراتەوە تا کێوی تورعابدین درێژەی هەبووە. بە پێی ئەم بەڵگەنامەیە و گێڕانەوەی (توکولتی نینورتا) بە شێوەیەکی گشتی هەرێمی

زاگرۆس نیشتمانی هۆزی گۆتی بووە. کەتیبەی مالامیر بەختیاری کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە دەیسەلمێنێ کە ناوچەی نێوبراو واتە (ئەنزان)ش تیرەی گۆتی تیا نیشتەجێ بووە. ئەو ناوچانەی کە بەپێی بەڵگەنامەو کەتیبە کۆنەکان لە ژێر دەسەڵاتی گۆتیەکاندا بووە، ئەمڕۆکەش هەموو دانیشتوانەکانیان کوردن.

دەربارەی ئەو دەوڵەوتانەی کە گوتی، سوبارو، لولو، کوسی، میتانی، نایری، موشکی، خالدی،ماننائی، ماد، کە باوباپیرانی کورد لە خاکی خۆیاندا دروستیان کردوون، نووسەری ڕەحمەتی ئەمین زەکی بەگ لە مێژووەکەی خۆیدا بە درێژی باسی کردووە. بۆ زانیاری پتر بڕوانە کتێبی نێوبراو. زۆر جێی داخە کە ئەم کتێبە بە نرخە لە کاتێکدا دەربارەی نەژادی ئێرانیە، تەرجەمەی زمانی عەرەبی کراوە کەچی هێشتا نەکراوە بە فارسی.

میللەتان لە تیرەو هۆزی جیاواز پێکهاتوون کە هەریەکەیان ناوی سەربەخۆی خۆیان هەبووەو بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار ژمارەی ئەم تیرەو هۆزانە زیادی کردووە. لە نێو ئەو هۆزو قەومانەی کە هێشتا هەندێکیان بە شێوەیەکی خێڵەکی و کۆچەری دەژین و ئەم دەستوورەیان بە روونی پێوە دیارە.

بۆ نموونە:

زۆربەی کوردستانی باکوور بریتییە لە دوو تیرەی گەورە:

أ/ زیلان- زیل بەکوردی ناوی گیایەکی ناسکە کە لەسەر کێوان دەڕوێ.

ب/ میلان- مل بە کوردی ملەی کێو دەگەیەنێ..

تیرەی زیلان: ناوی سەرۆك تیرەکە "زیل" بووەو بە رەعیەتەکانی گوتراوە (زیلان). زیل، کوڕێکی گەورەی بووەو کە ئەو کوڕەی دەمرێ (جەلال)

ناوێکی لە پاش بە جێ دەمێنێ. واتە (جەلال) نەوەی (زیل) بووە، هەروەها زیل دوو کوڕی دی هەبوون بە ناوانی (حەیدەر) و (مەمی). پاش مردنی زیل کوڕەکانی لە یەکدی جودا بوونەتەوەو هەر یەکەیان بە نێوی خۆیەوە تایفەی: (جەلالی)، (حەیدەری)و (مەمان)یان دامەزراندووە. تەنیا بە شێك بە ناوی (زیلان) ماوەتەوە. ئەم چوار تایەفەیەش بە هەمان شێوە تایفەی دیکەیان لێ بووەتەوە. لە کاتێکدا هەر هەموو ئەم تایفانە (زیلان)ن، ئەو بەشەی کە بە نێوی (زیلان) ماوەتەوە لە رووی ژمارەوە لەوانی دی کەمترن. ئەم تایفانە زۆر جار بەگژ یەکدا چوونە. ئێستا بیری یەکێتی نەتەوەیی و کەلکەڵەی ئازادی، لە تورکیادا تەبای کردوون.

ئایا بەم جیاوازی ناوو پێکادانانەیاندا دەکرێ بوترێ ئەمانە سەر بە نەژادی جیاواز یا میللەتانی جیاوازن؟! تا بۆ کۆنتر بگەڕێینەوە ئەم بنەمایانە روونتر دەبێتەوە...

ناوی یەکێك لە خوداوەندە کۆنەکانی کوسییان (هوژا) بووە، لە سەردەمی ساسانییەکانیشدا (خوژا)و (خوژای) گوتراوە. بۆ نموونە (خوژای نامك) ناوی یەکەمی شانامەیە. پاشان بووە بە (خودا) چونکە خودان بە مانای خاوەندە ئیدی مەعلومە کە (هوژا) بە مانای (ڕەب) بەکار هاتووە.

بە تواناترین پاشای کوسی- کوش- لە بابلدا (ئاگوم کاك ریم) بوو کە لە ساڵی (١٧٠٠ پ.ز) دەسەڵاتی گرتە دەست و هەموو ناوچەکانی سۆمەری خستە سەر ئاکاد و ناوی نا (کاردونیاش)! مێژووی کوردو کوردستان لەمبارەیەوە دەنووسێت: "هەندێك دەڵێن (کاردونیاش) ناوە کاسایییەکەی شاری بابل بووە. (سیرکیغ)ی رۆژهەڵاتناس دەڵێت: "کاردونیاس، مانای هەرتك وڵاتی یەکگرتووی سۆمەرو ئەکەد بووە. (سیرسیدنی سمیپ) دەڵێت: "دونیاش،

یەکێك لە پەرستراوەکانی کاسای بووەو (کار)ش مانای خاك و وڵات بووە، کاردونیاش، یانی مەملەکەتی دونیاشی خواوەند، ئایا ناشێت کاراد و کاردو پەیوەندییان بە وشەی (کاردونیاش) یا (کاردونیش) هەبێ. (نیش، نیژ) لە زمانی کۆنی ئێرانیدا بە مانای مەنسوبیەت، ناوەوە، پەیدا بوون هاتووە. هەروەها لە ساڵی (١٤٥٠ پ.ز) ناوی پاشای کوسی (کارا ینداش) بووە! کە دوای (کاردا) گۆڕاوەو بووە بە (کاردوش).

ئەحمەد رەفیق بەگی مێژوونووسی عوسمانی لە مێژووە گشتیەکەی خۆیدا، کوسیەکانی بە باپیرانی کوردانی ئەمڕۆ داناوە. هەروەها کتێبی (ایران نامە، یا کارنامە ایرانیان در عصر اشکانیان) لە بەرگی دووەمیدا دەربارەی کوردستان یا (سویچرە)ی ئێران دەنووسێت: "لەوەیە ئەو ئارییاییانەی کە لە ساڵی (١٨٠٠ پ.ز) لە بابل فەرمانڕەواییان کردووەو یاسازانان و زاناو فەیلەسوفانیان تێدا هەڵکەوتووەو لە مێژوودا بە کاسو یان کاسیت ناسراون، باو باپیرانی کوردەکانی ئەمڕۆ بووبن."

(تاج العروس) لە مەڕ کوردەکان دەنووسێت: "کوردی کوڕی کەنعان کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نوح)ـە. (کوش) ناوێکی تری کۆسیە کە ئەمەش ئەوە دەسەلێنێ کە کۆسیەکان باپیرانی کوردەکان بوونە.

لە سەدەی شازدەی پ.ز، لە دەڤەرێن سەرووی دیجلەو فورات واتە لە نیشتمانی گۆتیەکاندا لە بەشێکی خاکی سوباری دا حکومەتی بەهێزی میتان سەری هەڵدا کە (تەهوتمسی یەکەم)ی فیرعەونی میسر پەلاماری داو شکاندی. دوایی پاشای میتانی (کوشان ریشی ئاسام) سوریای داگیرکردو هەشت ساڵ حوکمی کرد. لە رۆژهەڵاتیشەوە ئاشورستانی داگیر کردو سنووری دەسەڵاتداریەتی خۆی گەیاندە کەرکووك. ئەم دەوڵەتە لە ساڵی

١٢٥٠ پ.ز پەیمانێکی لەگەڵ دەوڵەتی هیت دا مۆر کردووە کە بەردەنووسی (کەتیبە)ی ئەم پەیمانە لە (بوغازکوی) پایتەختی کۆنی هیتیەکان دۆزراوەتەوە. گەورە پیاوانی میتانی سوێندیان بە خواوەندی (ئاندرا- وا رونا) خواردووە. چونکە ئاندرا خواوەندی ئارییەکانی هیندیش بووە، دەبێ بگوترێ ئەم تیرەیە پێوەندی بەو تیرانەوە هەیە کە روویان کردووەتە هند.

دەوڵەتی میتانی لە رۆژاوا و باشووری رۆژاوادا هاوسێ و هاوسنووری دەوڵەتی هیت و میسر بووە. لە کاتێدا پێکادای کاسیتەکان یەکەمجار دەگەڵ هیتیەکاندا بووە، لەم حاڵەدا پێویستە چ پەیوەندییەکیان لەگەڵ میسرییەکاندا نەبووبێ. جا چۆن لە نێوان میتانی و میسرییەکاندا شەڕو پێکادان روویداوە.

بەم پێیە دەبێ بگوترێ: یا میتانیەکان بەگژ کۆسیەکاندا چوون و پاشەکشەیان پێکردوون و خۆیان گەیاندووەتە سنووری میسر، یا کۆسیەکان بە رەزامەندی خۆیان ئەو ناوچانەیان بۆ میتانیەکان چۆڵ کردووە. یا لە بنەڕەتدا میتانیەکان لەگەڵ کۆسیەکاندا هاونەژاد بوونەو بۆ خۆیان مالیات و ئەنجومەنی سەرکردایەتیان هەبووەو ئازادی کار کردنیان هەبووەو هەر بە ناو سەر بە کۆسیەکان بووە. چونکە چ بەڵگەیەك لە دەستدا نیە ئاماژە بۆ جیاوازی کۆسی و میتان دەکات. دیارە پێدەچێت ئەم بۆچوونەی دواییان لە راستیەوە نزیکتر بێ. چونکە (سیر کیغ)ی رۆژهەڵاتناس، میتانیەکانی بە تیرەیەکی کۆسیەکان ناسیوە. (جونسن)ش دەڵێت: "میتانی لە ماڵباتی حوکمدار بوودو نە ئەسڵ لە سوبارییەکانی بووە. ئەمین زەکی بەگ ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە میتانیەکان لە کۆسیەکان بوونەو سەر بە تیرەی (سوبارێ) بوونە.

نێوی (ئارتاتمە)ش هەم لە لیستی پاشایانی کۆسی و هەم لە لیستی پاشایانی میتانیدا دەبینرێ. هەر ئەم( ئارتاتمە)یەی پاشای میتانی بوو کە کیژەکەی خۆی دایە فیرعەنی میسر. (دلاپورت)ی لێکۆڵەرەوەش میتانیەکانی بە تیرەیەکی کۆسی زانیوە. مێژووی کوردو کوردستان لەم بارەیەوە دەنووسێت: "تایفەیەکی سەرەتایی کە ناوی (ئوممان- ماندا) بوو لە زومرەی ماد، سیت بووە. لە کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەشدا ئاکنجی بوونەو لە نەژادی هند- ئێرانی بوونەو جەماعەتێکی بچووکیان کۆچیان کردووەو تا ڕۆژاوای کوردستان هاتوون و یەکێك لە بنەماڵەکانیان بە ناوی میتانی حکومەتیان دامەزراندووە". کەواتە دەبێ بگوترێ: کۆسیەکان بە هاوکاری هاونەژادەکانی خۆیان، واتە بە کۆمەکی سوباریەکان وەختێ کە (بابل)یان داگیر کرد، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ دەوڵەتی هیت و میسردا شەڕیا کردووە. پاشان تایفەیەك لە سوباری و لە خێڵی نایری کە شوێنیان بەشی باکووری کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش بوو یا لە پێناوی سوود وەرگرتن لە فەتح و سەرکەوتنی هاونەژادەکانی خۆیان بە مەبەستی یارمەتی دانیان یەکڕاست روویان کردووەتە بەرەی شەڕەکە و خۆیان گەیاندووەتە دەفەری سەرووی دیجلە و فورات و بنەماڵەی سەرۆکانی ئەو تایفەیە کە ناوی خۆیان لە ناوی خواوەندی خۆیان (میترا) وەرگرتبوو، دەوڵەتێکیان بە ناوی میتانی دامەزراندو دەستیان کردە شەڕ لەگەڵ دژمنانی کۆسیەکان، واتە دەگەڵ دەوڵەتانی هیت و میسر، پاشان دەستیان بەسەر (ئاشورستان)شدا گرتووە.

لەو سەردەمەدا کە میتانیەکان لە باکووری ئاشوردا بوونە، شەڕو پێکادانیان دەگەڵ ئاشوریەکاندا هەبووە، پاشای ئاشوری دەربارەی میتانیەکان لەو ناوچەیەدا دەڵێت: "خوێنی گۆتیەکان وەکو ئاو دەڕژا". لێرەدا هەموویان بە

گۆتی نێو براون. له راستیدا له ناوچەی دەرسیم کە تورکەکان لەم دواییانەدا ناویان گۆڕیوەو کردوویانەتە (تونجەلی)- بەشی باکووری خاکی میتانیەکان بووە- دۆڵێکی مەنشوور هەیە کە تا ئەمڕۆش پێی دەڵێن دۆڵی گوتی، بە -گۆتی دەرەسی- بەنێو بانگە.

کتێبی موقەدەسی یەهود تایفەی میتانی بە (ئارام نهارم) قەید کردووە. ئەو مەملەکەتەی کە لە باکووری فەلەستیندا بوو، واتە لە رۆژهەڵاتەوە دیجلەو لە باکوورەوە کێوەکانی تۆرۆس دەوریان دابوو، (ئارام)ی ناو بوو. عبریەکان "ئارام نهریم" (کتاب پیدایش، ٢٤: ١٠) یا "پدن ئارام" واتە دەشتی ئارام - یان پێدەگوت. بەمەدا وا دەردەکەوێ کە میتانیەکان، خاکی ئارامیەکانیان گرتووەو کتێبی پیرۆزی یەهود ئەم هۆزەی بە ناوی شوێنە جوگرافیاییەکەوە ناو ناوە (ئارام نهارم). میسریەکان پێیان گوتووە "ناهاری". (نهارم و ناهاری) زۆر لە (نایری) دەچن کە لە زومرەی سوباری بووە. پاشایانی ئاراراتیش خۆیان بە نایری دەزانی و ناو و شوێنەواری خالدیەکان کە بە میللەتی ئارارات دەگوترا، لە قەوقاز، لە کەناری دەریای رەشدا، و تەنانەت لە پالوو مەلاتیەدا کە مەملەکەتی میتانیان بووە بەرچاو دەکەوێ. دەشێت بگوترێ لە کەنارێن رۆژهەڵاتی باشوری دەریای رەشدا عێڵی نایریەکان نیشتەجێ و ئاکنجی بوونە، میتانیان لەوێوە بەرەو باشور هاتوون.. لە سەرێ ڕا ئاماژەم بۆ ئەم باسە لەمەڕ عێڵی نایری کردووە.

زۆر ئەستەمە ناوانی: گۆتی، کورتی و کۆسی لێکدی جودا بکرێنەوە. لەو مەملەکەتانەدا کە بوو بوو بە نیشتمانی گۆتیەکان، لەوێدا کورتی و کۆسیەکان، ئەو شوێنەی کە بوو بووە مەڵبەندو نیشتمانی کۆسیەکان، وەك: ئەنزان، لورستان، لەوێش کۆتی و کۆرتی و بلادی کە کاردۆ و کۆرتیەکان

ئاکنجی بوون، گوتی و کۆسیان دەبینین. بەم پێیە نابێ گومان لەوەدا هەبێ کە ئەم سیانە ناوی یەك میللەت بووە و کورتی و کۆسی کە گەورەترین تیرەی گۆتی بوون گوتراوە کە تێکەڵی یەکتر بوون و پێکەوە ژیاون لە ئەنجامدا بەگشتی ناوی کوردیان بە بالآدا بڕاوە. نیشتمانیان لە کۆنی کۆنا لە رۆژهەلأتی ئێرانەوە تا ئاتنە و لە قەفقازو کەنارێن دەریاێن خەزەرو رەش‌ەوە تا شووش درێژەی هەبووە. ئەم میللەتە بە ناوی گوتی و سۆباریەوە لە باکوری شووشەوە تا ئاتنە حوکمڕانی کردووە، پاشان کۆسیەکانی ئاکنجی زۆزانی رۆژاوا و باشوری دەریای خەزەر بە ناوی تایفەی (کی خودکاسیت) لە دوو هەزاری پێش زایندا، بەرەو باشور کۆچی کردووە و هاتووەتە لوڕستان، لەگەڵ بەشێکی تری عێڵی خود کۆسیانی باکوری ئەنزان و بە کۆمەکی گۆتیان پەلاماری (بابل) یان داوە، هیتەکانیان، کە لە باکورەوە هاتبوون، دەپەڕاندووە و بە خۆیان جێگیر بوون و لە بابلدا دەولەتی (کاردونیاش)یان دامەزراندووە. پاشان ماڵباتی میتانی لە باکوری جەزیرەدا دەولەتی میتانی دامەزراندووە کە هەرتکیان یەك میللەت بوونە. کێردێکی برونزی نەخشین، لە کۆڵنیکاریە ئارکۆلوجیەکانی لوڕستاندا دۆزاوەتەوە کە لەسەر دەسکەکەی ناوی (بخت نسر)ی پاشای کاسیت نووسراوە.

کتێبی (دۆزی کورد) لە بلآوکراوەکانی (خۆیبوون)، جفاتی وەلآتی کورد دەنووسێت تیرەی کەلهوڕ بە گوێرەی ئەو شوێنەوارە ئارکۆلوجیەی کە لە ناوچەی ئەواندا دۆزاراوەتەوە، خۆیان بەنەوەو نەتیرەی (جودەرز)ی کوڕی گیو، کە کوڕی رحامی پێ گوتراوە، و لەلایەن (بەهمەن گیانی)یەوە بۆ وێرانکردنی قودس و بەدیل گرتنی جولەکە نێردراوە. رحام بە گوێرەی

١٩نـب و سەرچـاوانی عـەرەبی (بـەخت نەسـر)ی بەناوبانگـە کـە پاشـان
٠٠ەوەکانی ئەو بوون بەپاشایانی جوردان.
(بەخت نەسر) لە ساڵانی ٦٠٤-٥٦٢پ.ز پاشـای بابـل و زاوای (ئیختـو ویکو)ی
پاشای ماد بوو لە خوزستاندا کۆمەڵێك فتوحاتی کردبـوو. ئـەم پاشـایە بـوو
٨١ بۆ ژنەکەی خۆی، کیژی پاشای ماد، باخچە هەڵۆاسـراوەکانی دروسـتکرد،
پێناچـێت کـە جـودەرزی کـوڕی گیـو بـێ. کتێبـی ئاوێـستا نـاوی لهراسـب
بەکیلهراسب تۆمار دەکات و بە (گیانی)یان دەژمێرێ. ئەسپ، هـەمان ئەسـپە
٨٦ لە نێو ئاریاندا خوشەویست بووە، زۆربەی گەورە پیاوانی قـەوم لـە دوای
ناوی خۆیانـەوە بەکاریان دێنا- وەك: لهراسب، کشتاسپ، ئەشپ بـرە.. ئەسـپی
نوداتا (ئەسپ نوداتا، ناوی برایەکەی گوماتای موغ  بوو کە لـە هەمـەدان لـە
غیابی کوڕی کۆروش دا لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتبوو).
ئەگەر وشەی ئەسب لە کیلهراسب هەڵگرین دەمێنێتەوە (کیلهر) کە لەوەیـە
لیرەی کەلهور ناوی خۆی لە ناوی (کیلهر)ەوە وەرگرتبێ!..

((٢))

## مێژووی کورد

بەو جۆرەی لە سەرێرا ئاماژەی بۆ کرا، لە سەردەمە کۆنەکاندا لە پێشینان و باپیرانی کوردا، تیرەو تایفەی جیاواز و جۆراو جۆر لە مێژووی جیاوازدا لە کوردستاندا دەوڵەتی جیاواز و سەربەخۆیان دامەزراندووە. بۆ تەواو کردنی مێژووی کورد پێویستە مێژووی دەسەڵاتدارێتی کورد هەمووی بنووسرێتەوە، ئەوەی کە هەیە دۆزینەوە ئارکولوجی و بەردەنووس و کەتیبە کۆنەکانە کە زانیاری تەواویان نەخستوەتە بەر دەستمان، تەنیا نووسینە کۆنە ئێرانی و ئاشوریەکانە کە دەمانخاتە سەر راستە رێگاو لەم بارەیەوە رێنوێنیمان دەکات.

بە گوێرەی ئەو رونکردنەوانەی لەبەر دەستدان، دەسەڵاتدارێتی وسەڵتەنەتی نەژادی ئاریان لە ئێران و لە باکوری عێراق و سوریادا، لە گۆتیەکانەوە دەستی پێکردووە. گونجان و تێککردنەوەی ناوەڕۆکی شانامە لەگەڵ وەزع و حاڵ و ڕووداوەکانی رۆژاوای ئێراندا ئەمە دووپات دەکاتەوە،

و دەری دەخــات كــە جەمــشید یــەكێك بــووە لــە پاشــایانی (كاســیت) و میللەتەكەشی جگە لە (كۆسیەكان) كەسی دی نەبووە. دەبێ حیسابی تـەواو بۆ سەرچاوەكانی شانامە، كە (خوژای نامك)ی پەهلەوی و بەیتـە فۆلكلۆریـە كوردیـەكان بـووە، بكرێ، نـابێ چـاو پۆشـی لـێ بكـرێ. كـۆنترین خوژاینامـە هەمان دوانزەمین نەسكی ئاوێستا بووە (نەسك: ناوی هەر یەكێك لـە بیـست و یەك بەشەكەی كتێبی ئاوێستایە- وەرگێڕ) كە لە سـەدەی سێیەمی كۆچـی دا، واتـە لـە زەمـانی (ئـاژر فرنبـغ)ی دانـەری (دیـن كـەرد –دینكـرت: din kard)دا هەبووە، (بڕوانـە: كتـاب ادبیـات مـزد یـسنا پـشتها). لـە سـەردەمی ئەسكەندەری مەقدۆنی دا، كتێبـانی ئێرانـی، لەوانـە كتـێبی ئاوێـستا كـە بـە گوتەی (پۆلین)ی مێژوونووسـی سـەدەی یەكـەمی زایـنی دوو ملیـۆن شیعرو لەگەڵ سەرچاوەو دەهمەنـە پەهلـەوی و عەرەبیەكانـدا دوازدە هـەزار چـەرم بـووە، لـە كۆشـكی شاهنـشاهی هەخامەنـشیەكاندا سـووتێنران. ئەشـكانی و ساســـانیەكان لـــە پاشمـــاوەی نووســـراوان و لـــە زاری بـــەیت بێـــژو حیكایەتخوانانــەوە هەنــدێ بەرهــەمیان بــە زمــانی پەهلــەوی نوســییەوە. عەرەبـەكان كـە هاتنـە ئێرانـەوە بـاوەڕی ئـاینی خۆیـان بەسـەر خـەڵكی دا سەپاندو كردیانن بە موسولمان، گوتیان ئەمانە كتـێبی كـافرانن و خـستیاننە ئـاگرەوە، واتـە نووسـراوە پەهلەویـەكانیان خـستە ئـاگرەوەو سوتانیانن. بـۆ ماوەیـــەك زمـــانی رەسمـــی مەملەكـــەت بـــوو بـــە عـــەرەبی، ســـەردەمی بڵاوبوونــەوەی ئیــسلامیەت، ســەردەمی شــیعری رەوان و رەوانبێــژی بــوو، چونكە زمانی دەری- دەرباری- لە زمانی پەهلەوی ئاسانترو رەوانتر بووەو بۆ زمانی ئەدەبی و دەرباری ئێران دانرا بوو. میرانی سامانیە ئەو زمانەیان بـە زمـانی رەسمـی مەملەكـەت قـەبوڵ كـرد. خۆشـبەختانە (خـژای نامـك) لـە

ئاسێوی عەرەبەکان خەلەسی بوو. لە ساڵی ٣٤٦ی کۆچی دا، بە فەرمانی سوپاسالاری خوراسان ئەبو مەنسور محەمەد کوڕی عەبدورەزاق تووسی، وەزیرەکەی ئەبو مەنسور معەمەری زەواتی چەند شاعیرێکی ناسراوو شارەزایی بواری بەیت و داستانی فۆلکلۆری کۆکردەوە، ئەوانە (خوژای نامە)یان بە فارسی تەرجەمە کردو زانیاریەکانی خۆشیان خستە سەری و بە ناوی شانامەی ئەبو مەنسوری کتێبێکیان نووسی چەند ساڵ دواتر فیردەوسی رەحمەتی سوودی لەم کتێبە وەرگرت بۆ بزواندن و جۆشدانی هەستی نەتەوایەتی ئێرانیەت و گەلێك چیرۆك و ئەفسانانی بە خەیاڵاتی شاعیرانە رازانەوەو ناوی شانامەی لێنا، ئەگەرچی ناوەکانی ناو شانامە لەگەڵ ناوە ئەسڵیەکانی شانامەی ئەبو مەنسوریدا تەواو چوون یەك نین و لە زۆربەی شوێنەکاندا رووداوەکانیش تەواو لێکدی دوورن. ناوی ئەو پاشایانەی کە لە ئاوێستادا هاتووە، لەگەڵ ناوی پاشایانی (خژای نامك)، شانامەدا یەك نین. لە دەقەکانی ئاوێستاوە ئەوە دەردەکەوێ کە ئەوانە پاشایانی تیرەو تایفەکانی رۆژاواو باکووری رۆژاوای ئێران بوونە. مەیدانی چالاکیەکانیان بە زۆری دەوروبەری دەریاچەی چیچیست —رەزاییە- و دەریاچەی هویسرەوە —وان- واتە لە ناوچەی زێدو زاگەی پێغەمبەری ئاریان حەزرەتی زەردەشت بووە. لە شوێنی خۆیدا ئەمە روون دەکرێتەوە. بە هەر حاڵ کەسێك بیەوێ مێژووی نەژادی ئێرانی بنووسێتەوە نابێ ئەو شتانە بە بێ بناغەو ئەسڵ بزانێ. فەرامۆشکردنی ئەو شتانە لە ئەقڵ و ئینساف و کەشفی حەقیقەت بە دوورە.

هەر چەندە مێژووانی کۆن، ئەمرۆکە وەکو ئەفسانە و خوارفات دێتە بەرچا و لە راستیا لە ئەفسانە کۆنەکان و لە کتێبانی ڤیداو ئاوێستاوە هەڵقوڵاون.

بەڵام قەومی کوردی ئەمڕۆ کە وەچەی دەست لێنەدراوو پاکی ئەو ئەسڵزادە کۆنانەن، چونکە نیشتەجێی چیای سەخت و حاسێ بوون، بە تەواوەتی، زمان و خەسڵەت رسومات و داب و نەریتی کۆنی خۆیان پاراستووە. یەکێك لەو داب و نەریتانە ئەوەیە کە شەڕو شۆڕی باو باپیرانی خۆیان لە شێوەی بەیت و لاوك دا دەگێڕنەوەو لە راستیدا گۆرانی و حەیران و لاوکە کوردیەکان، لە سەدا شەشتیان باسی شەڕو شۆڕی باو باپیرانیان دەکاو دەنگبێژو گۆرانی بێژانی کورد میناکی مێژووییەکی زندوو وانە. لە زەمانی زۆر کۆندا کەخوێنەواری نەبووە، لە رێگەی گۆرانی و بەیت و داستانەوە حونەرو مێراتی پاشایان و دلاوەرانی خۆیان دەماو دەم گەیاندووەتە گوێی مێژوونووسان و نەیان هێشتووە بیر بچنەوە. هەر چەند تێپەڕ بوونی رۆژگار گەلەك گۆڕانی بەسەر ئەم بەیت و چیرۆکانە هێناوەو ناوی قارەمانەکان و شوێنی رووداوەکان، کەم و زۆر گۆڕانیان بەسەر هاتووە، بەڵام بناغەی رووداوەکان بە تەواوی لە بەین نەچوونە، بۆیە قوڵبوونەوە لەم باسە نەك زیانی نییە، بەڵکو بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتەکان پێویستیشە.

بەڕای من ناوی کەسایەتیە مێژووییەکان لەگەڵ قارەمانە ئەفسانەییە ئاینییەکاندا تێکەڵ بوون و چوونەتە کتێبی مێژووەوە. واتە مێژوونووسان کەسایەتیە ئەفسانیەکانیان لەگەڵ قارەمانانی گۆرانیەکاندا وێك خستووەو بەمەش خزمەتێکی گەورەی مێژووی کۆنیان کردووە.

بۆ نموونە: کیومرپ کە ئاوێستا (گیە مرپ)ی ناو ناوەو بەیەکەم پیاوی تیرەی بەشەری دەناسێنێ، بە گوێرەی ئاوێستا (مشیاو مشیانە) واتە ئادەم و حەوا، لە دوای مردنی ئەو لە نوتفەی ئەو کەوتوونەتەوە. مێژوونووسان بۆ ئەوەی بچێتە ئەقڵەوە بەوەچەی نوحیان نیشانداوە، جەمشیدی پاشای

ناودارو بەشکۆی ئێران ناوی لە ئەدەبیاتی سانسکریتی دا هەیەو لەگەڵ (یمی) ژنیدا بە یەکەمین جووتی بەشەر هاتۆتە ناسین.
ئەوەی لە شوێنەوارە کۆنەکانەوە مەعلوم بووە، ئەومیە کە سەڵتەنەت و حوکمڕانی ئێران لە کوردستانەوە لە دایك بووەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە. چونکە ئەم کۆجاڕانە شوێنی کۆنی گۆتیەکان، کۆسیەکان، مادو پارسەکان بووە. پێویستە لە نێو سەران و پاشایانی ئەم تیرانەدا بۆ پاشا کۆنەکانی ئێران بگەڕێین.
تا داریوش، کەیخسرو –کورش- ئاشکرایە. تەنانەت بە گوتە زۆربەی زانایانی مێژوو، شای یەکەمی کیان –کەی قوباد- بەناوی دیاکۆ- دیوسیس دامەزرێنەری سەڵتەنەت و دەسەڵاتی مادە، کە سەرۆکی تیرەی مانتایی بووە. فەریدونی کورد کە ئاریاسی ناو بووە، لە دەوروبەری (٨٠٠-٩٠٠ پ.ز) هاتووە. بەم حسێبە سەردەمی زوحاکەکان لە ٩٠٠ساڵی پ.ز سەروتر دەبێ، کە ڕێکەوتی ساڵەکانی پاش شکانی کوسیەکان لە بابل دەکات. بەر لە زوحاك جەمشید بووە کە ڕێکەوتی سەردەمی دەسەڵات و سەڵتەنەتی کۆسیەکان لە بابل دەکات. بەر لە کۆسیەکانیش دەورەی حوکمداری گۆتیەکان بووە، مێژووی (زاگرۆس)ش لەگۆتیەکانەوە روون بووەتەوە، بەم پێیە دەتوانین کیومرت بە شای یەکەمی (جوتی، گوتی- guti، و کوردۆ بزانین. هەر چەندە مێژووەکانی پێش کیو مرت دەسەڵات و سەڵتەنەتی جیانیەکان نیشاندەدەن و کیومرپ بە ئەوەی ئەوان لە قەڵەم دەدەن. دەڵێن بەر لە کیومرپ پێغەمبەران هەبوونەو پێیان دەگوتن (مەهاباد) واتە گەورە ئاوایی. دەڵێن دەسەڵات و پێغەمبەرایەتی ئەوان لە سەردەمی ئازەرئابادا تەواو بووە. ئازەرئاباد وازی هێناوەو خۆی بۆ عیبادەت و خوا پەرستی تەرخان

کـردووه.. فیتنـەو ئاشـوب لـە نێـو خـەڵکی دا پەیـدا بـووە... یـەکێك لـەو خـەڵوەت نـشین و زاهیدانـە نـاوی (جـی ئـەفرام) بـووە –جـی بـە زمـانی پەهلـەوی واتـای پـاك دەگەیـەنێ... ئیـدی دەمڕاسـت و ردێـن سـپیانی ئـەو سـەردەم و وەختـە داوایـان لێکـردووە بـبێ بـە سـەرۆکی حکومـەت و ئـاینی مەهاباد زیندوو بکاتەوە. هـەوەڵجار قاییـل نـەبووە، پاشـان جبرائیـل سـڵاوی خوای لێ بێ وەحی بۆ هێنـاوەو ئـەویش قاییـل بـووە. (جـی ئـەفرام) کـوڕی ئازەرئاباد بووە. ئەو زنجیرە پاشایانەی کە لە نەوەی ئەو بوونـە (جیـان)یـان پێگوتراوە. ئەفرام، لە ئیبراهیم دەچێت کە بە راستی کوڕی ئازەر بـووە. جـا رەنگە (جی) کورتکراوەی (جوتی) بێ کە ناوە سامیەکەی (گوتی)یە.

بە قسەی شانامە، لە (کیـومرپ)ەوە تـا (کیقبـاد- دیـاکو ٢٤٤١ سـاڵ تێپـەڕیوە. مێژووی هاتنە سەر تـەختی (دیـاکۆ) بـە سـاڵی (٧٠٥ پ.ز) دیـاریکراوە. بـەم پێیە پاشایەتی (کیو مرپ) دەکاتە ساڵی ٣١٤٦ پ.ز) یەکەم شای گۆتی، کە تـا نێستا کەشف بووە ناوی (ئانناتوم) بووەو لە سەدەی سیو یـەکی پـێش زایـن ژیاوە. بەم پێیـە حیکاتخوانـانی هـەوەڵ، لـە چـاو درێـژی رۆژگـارا بـە چـاکی دەسەڵاتی (گۆتویان) گەیاندوومتە ئێمە.

لەگەڵ ئەوەشدا سەڵتەنەت و دەسەڵاتی گوتیەکان لـەوە کـۆنـترە کـە مێـژووی (جیانیان) و مەهابادیەکان دیاری کردووە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە هێـشتا چ بەڵگەنامەیـەك لـەم بارەیـەوە بـە دەسـت نـەهاتووە جگـە لـە دەسـەڵاتیان لـە سۆمەرا...

ئاوێـستا (کیـو مـرپ) بـە (گیـو مـرت) نـاو دەبـاو بـە یەکـەم کەسـی تـیرەی بەشـەری دەزانـێ و (کیـومرپ لـە پەهلەویـدا دەبـێ بـە کیـومرد) –مێـژووی جولەکە بە نەوەو وەچەی نـوحی دەزانـێ (زینـە التـواریخ) دەڵێـت: "کوڕی

یەسان ئاجام نەوەی نوحە. لەم بۆچوونە مێژوویانەوە بە دیار دەکەوێ کە (کیومرپ) و میللەتەکەی لەدەوروبەری مەملەکەتەکەی نوح بووەو لەگەڵ ئەو قەومەدا کە لەو ناوچەیە دادەنیشتن هاو نەژادییان هەبووە. کەتیبەیەکی سەردەمی سۆمەریەکان باسی تۆفانەکەی نوح دەکات و حەزرەتی نوحی بە (زیوکیدو) ناو بردووەو شوێنەکەی بە (پاتزی) ناو بردووە. جا چونکە کوسیەکان بە حاکمیان دەگوت (پاتزی) و شوێنی کۆنی گۆتیەکانیش (زێی کویە) بووەو ئەو تیرەیەی کە لە سەردەمی ئاشوریەکاندا لەو ناوچەیە ژیاون پێیان گوتراوە (زیگرتو)، و چونکە تۆفان لە خاکی گۆتیەکان هەستاوەو حەزرەتی نوح کە (زیوکیدو) بووبێ، کەواتە پاشای گوتیەکان بووە. مەسەلەی تۆفانەکە زۆربەی میللەتانی کۆن لە ناوچەی خۆیاندا داویانەتە پاڵ کەسێکی ئەفسانەیی کە زۆربەیان لێکدییەوە نزیکن، بەڵام چونکە ئەمە بۆ باسەکەی ئێمە مەبەست نییە، لێرەدا پێویست بە باسکردنی نییە. لە سەرێ ڕا ئاماژە بۆ ئاریایی بوونی سۆمەرییەکان کرابوو. ئاشوریەکان لە نەینەوادا، واتە لە نیشتمانی نوح دا، لەو سەردەمەدا کە گوتیەکان لە بابل سەڵتەنەت و دەسەڵاتیان هەبووە پەیدا بوونە. دەبێ ئەوە بگوترێ وەختێ کە بابل، لەلایەن کۆسیەکانەوە داگیر کراوە، بەشێك لە بابلیە سامی نەژادەکان بەرەو باکوور کۆچیان کردووەو لە ناوچەی نەینەوا گیرساونەتەوە. نووسینەکانی (دکتر، د، بهروز) کە لە گۆڤاری ئێران کودە، ژمارە هەشت بڵاوبووەتەوە، ئەو شوێنەوارە شارستانیە کۆنانەی کە لە دەڤەری نەینەواو دەوروبەری دۆزراوەتەوە، ئەوە دەسەلمێنێ کە خەڵکی کۆنی وێندەر لە نەژادی سۆمەری و خەڵکی دەشتی ئێران بوونە، ئەم سەرزەمینە ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەڵاتو حوکمی (ختی، میتنی، کاشی)

بـوه، (مەبەسـت: گـوتی، میتـانی، کوسـیه)، خەڵکەکەشـی: (خـتی ،میـتنی) بوونه.

کتێبــه پیرۆزەکــانیش، باســی تۆفانەکــەی نــوح دەکــەن، بــەگوێرەی فەرمایـشتەکانی قورئـانی پـیرۆز، کەشـتیەکەی نـوح لـه چیای جـودی و بـه قسەی عیساییەکان له کێـوی ئـارارات گیرسـاوەتەوە. هەنـدێ کـەس جـودی و ئارارات، به بۆنەی گیرسانەوەی کەشـتیەکەی نوحـەوە، بەیـەك کێـو دەزانـن، تەنانەت قاموسـی (کتـێبی پـیرۆزش) وەرگێـڕان و دانـانی (مـستەر هـاکس)ی ئەمریکایی لەمەڕ وشەی ئارارات ئەم هەڵەیەی کردووەو نووسیویەتی: "ئـەم کێـوە بـەرزە کـه ئەرمەنیـەکان میـسیس، تورکـەکان ئـاگری داغ، ئێرانیـەکان کێوی نوح، ئەوروپاییەکان به زۆری ئارارات و عەرەبەکان جودی پێـدەڵێن." له کاتێکدا ئارارات کەوتووەته سـەر مـەرزی ئێـران- سۆڤیـەت- تورکیـا، بـەڵام جـودی لـه بـاکووری موسـڵە، کەوتووەتـه ناوچـەی سـەر سـنووری تورکیـا- عێراق.

هـەردوو کێوەکـه کەوتوونەتـه خـاکی گۆتیـانی کـۆن. مـن گەلـەك شـوێنەوارو نیشانانم لەسەر ڕێگه شاخاویەکەی ئەرخ- شەڕناخ، که نیـشتمانی کارداکانـەو کەوتووەتـه بـاکووری جودییـەوە، بینیـوە کـه دەشـێت بکـرێن بـه بەڵگـەی تۆفانەکه، ئەو دانەوێڵانەی له کاتی تۆفانەکـەدا کەتوونەتـه ئاوەکـەوە، پـاش نیشتنەوەی تۆفانەکه لەسەر گڵەکه ماون و به تێپەڕبوونی ڕۆژگار بـوون بـه بەرد، تـا ئـەمڕۆش لـه شـێوەی پارچـه خـشت و کەسـتەکدا مـاون و دەکرێـت ڕەگـەزی دانەوێڵـەکانیان لێـوە بناسـرێتەوە. یـا ڕەنگـه ئـەم شـێوانه ئێـسکه پەیکـەری گیانــدارانی بـچووك بـن و لـه نێـو گـڵو قوڕەکـەدا مابنــەوەو

بووبنبەبەردو میناکی دانەوێڵە بێنە بەرچاو و بنوێنن. بەڕاستی دەکرێت بوونی تۆفان لە ناوچەی جودیدا قەبووڵ بکرێت.

کێوی جودی، لە کۆجارەکانی شەرناخ، ئەرخ، گویان، نزمترەو کەوتۆتە دەشتایی. رەنگە لە کۆسارەکانی بۆتان، شەمدینان، رەواندوزدا، واتە ئەو کێوە بەرزانەی دەڕواننە دەشتی هەولێر، جزیرە، موسڵ، هەندێ دەریاچە هەبووبن و لەگەڵ بوومەلەرزەیەکی توندا رووەو دەشت بووبنەوە. ئاوی دەریاچەکان لەگەڵ بارانی توندا بەرەو دەشتەکان چووەو خەڵك و ماڵاتی دەگەڵ خۆدا بردووە. حەزرەتی نوح کە دانیشتووی کۆجاڕ و سەرۆکی ناوچە بووە —ئەگەر دانیشتووی دەشت بوایە ئاو کەشتییەکەی بەرەو دەریا دەبردو بەرەو کێوی جودی، کە لە بەرزایی دەشتەکە دایە، نەدەبرد- دیارە هەستی بە مەترسی کردووە، بە کەشتییەکەی، کە لە دەریاچەکەدا بووە، خۆی و رەعیەتەکەی بردووەو گەییوەتە وشکایی و لە کێوی جودی گیرساوەتەوە.

لە راستیدا چۆمی رەواندوز، پاش تێپەڕ بوون لە شارۆچکەی رەواندوز، بە دۆڵو خەرەندێکی قوڵا رەت دەبێت کە ئەمبەرو ئەوبەری تاوێرەو وادیارە ئەم خەڕەندە لە ئەنجامی بوومەلەرزەوە دروست بووەو رێی بۆ ئاو کردۆتەوە.

ئەمە لەگەڵ گۆشەنیگای ئەو مێژووانەدا کە (کیومرپ) بە نەوەی نوح دەژمێرن تێکدەکاتەوە، چونکە تۆفانەکە لە خاکی گۆتیەکان هەستاوەو روویداوە.

(کیومرپ) گوایە لە گیان و مردنەوە هاتوودو بە واتای ژیانی فانی لێکدراوەتەوە. لە کاتێکدا بە قەولی ئاوێستا ئەگەر یەکەمین خەلقەندە (گاو بەشەر) لە هەردووك بەری چۆمی (ودائیت) رەچاو بکەین، لەگەڵ

ئەفسانەبوونیشیا، دەچێتە ئەقڵەوە (کیومرپ) بە مانای (گاو پیاو) قەبوڵ بکرێ.

ئەگەر لە واتای وشەکان ورد ببینەوە وەکو چۆن لە فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەدا روونکراوەتەوە، رەنگە بەوە قاییل بین کە وشەی گوتی لە راستیدا لە (گیوتی)ییەوە هاتبێ، کە برگەی یەکەمی (گیو) مانای (گا) دەدات. ئەم حەیوانە لای دانیشتوانی زاگرۆس لە کۆنەوە تاکو ئەمرۆ کاری یەکجار گرنگی بۆ رۆڵەکانی ئەم قەومە ئەنجام داوە ئەنجام دەدا، جگە لە جووت و زەوی کێڵان، لە کۆچ و کۆچباردا هۆی گواستنەوەش بووە بۆ شتومەکیان لە گەرمیان کوێستان کردنیاندا.

بایەخی (گا) لای میللەتانی ئاریایی بە رادەیەك بووە کە کتێبە ئاینیەکەیان وای لە قەڵەم داوە کە گاو بەشەر پێکڤە و لە یەك کاتدا خەڵق بوونە.

ئەگەر سەرنجی لێکچوونی دەستووری زمان و هاوبەشیەتی هەندێ وشەی نەوەکانی قەومی گۆتی لەگەڵ زمانی تیرە گۆتیەکانی باکووری ئەوروپا بدەین و لە ئاستی ناوی هاوبەشی خودایانی کۆنی هەردوولایان بوەستین کە یەکێکیان (گوت) و ئەویتریان (گوتیوم) بووە کە ئەمرۆکەش ئەڵمانەکان هەمان ناوی پێدەڵێن و کوردەکان (خودێ)ی پێدەڵێن و ئەم وشەیەش لە (گوتی) دەچێ ئەوا دەتوانرێ بگوترێ (گوت و گوتیەکان) لە زەمانێکی نەدیاردا لە یەك شوێن و بە ناوی یەکنەژادەوە ژیاون و پاشان لێکدی جودا بوونەتەوە.

هیرودۆت، لە باسی لەشکرکێشی داریوش بۆ سەر خاك و مەفتەنی سکایەکان لە تراکیەدا باسی وڵاتی گۆتەکان دەکات، ئەڵەمانەکانیش پێیان وایە گوتەکان خەڵکی کەنارێن دەریای رەش بوونەو لەوێندەرەوە بۆ باکوور

کۆچیان کردووە. کیومرپ بە (گیومەرز)ش هاتووە کە بە مانای پاشای زدمین و سنوور دێت. لێ ئەم ناوە زیاتر لە نازناو دەچێ تا ناو.

شانامە دەڵێت: (سیامەك)ی کوڕی (کیومرپ) سەرداری لەشکر بووەو لە جەنگی دێواندا کوژراوە... لە راستیدا گوتیەکان لە ئاخرو ئۆخری سەدەی بیست و حەوتەمی پێش زایندا، لەگەڵ ئەکەدییەکاندا بەشەڕ هاتوون و لەو شەڕەدا سەرۆکەکەی خۆیان لە دەست داوە. لەبەردەنووس و کەتیبەیەکەدا لە شارکالی شاری (٢٧١١: ٢٦٨٨ پ.ز) نەوەی نەرامسین بە جێماوەو بە دەست هاتووە، وا دەگەیەنێ کە (شرلك)ی پاشای گوتیەکان بە دەستی ئەم پاشایە یەخسیر بووە. لەم شەڕەدا گوتیەکان هێرشیان کردووە، هەر چەندە سەرۆکی خۆیان لە دەست داوە، بەلاّم هەر دەسبەرداری هێرشەکەی خۆیان نەبوونە و لە ئەنجامدا (بابل)یان خستوەتە ژێر رکێف و دەسەلاّتی خۆیان.

چونکە گوتیەکان دەستیان بە ولاّتگیری کردبوو لەم شەڕەدا (شرلك)ی پاشای خۆیان گوم کردبوو، و میللەت ناوی خستبووە گۆرانی و لاوژانەوە. بە تێپەڕبوونی رۆژگار (شرلك) بووە بە (سیامەك). لە شێوەزارە جۆراو جۆرەکاندا تیپە گۆڕکێ هەبووەو زۆر جار پیتی (س) بووە بە (ش)، (ی) بووە بە (ڕ) و (م) بووە بە (ل).

لە ئاوێستادا (سیامەك)ی کوڕی (مشیا) وەکو نەوەی (کیومرپ) ئاماژەی بۆ کراوە.. شانامە دەنووسێت: (پاش کیومرپ، هۆشەنگ بووە بە پاشا. ئەمەش لە ناوی (ئیکش هوش)ی پاشای گوتی دەچێت... لە ئاوێستادا ناوی ئەم پاشایە (هوشەنگە) و نازناوی (پرزات)ـە. هوشەنگ کوڕی فرداك، کوڕی سیامەك، کوڕی مشیا، کوڕی (کیومرپ)ـەو بە یەکەمین پاشای رووی زەمین زانراوە.

(پرزات) لە پەهلەوی دا (پشدات)ەو لە زمانی دەری دا (پیشداد)ـە. ئەو پاشایانەی کە دوای ئەوان هاتوون (پیشدادیان)یان پێگوتراوە.
بە قەولی شانامە پاش هوشەنگ، (گهمورپ کورد) دێت کە دێوانی حەپس و بەند کردووەو لەمەوە لەقەب و نازناوی (گهمورپ)ی دێو بەندی وەرگرتووە. وا دیارە ئەمە بە تواناترین پاشای گوی بووە.
گەورەترین پاشای گوتی ناوی (ئانری داپزیر) بووە، ئەم پاشایە قەڵەمڕەوی خۆی لە رادەبەدەر فراوان کردووەو گەییوەتە سنووری نارامسین. هەم کردارەکانی زۆر لە کرداری گهمورپ چووەو هەم ناوەکانیانیش لێکدی چووە! وشەی (داپیزیر) لەگەڵ تێپەڕ بوونی رۆژگاردا گۆڕاوەو بووە بە (دپرز"، (دمرز)، (تەهـ مەرز)، گهمورپ.. ناوی ئەم پاشایە لە ئاوێستادا (تخم اورپ)ـەو لەقەبەکەی (ئازینەونت)ە کە پاشان بووە بە (زیناوەند)و بە مانای چەکدارو پڕ چەك هاتووە. (تخم) مەعنای بە هێزو بازووە (ئازینە) دەبێ بە مانای ئاسن بێ کە تا ئەمڕۆش کورد (ئاسن)ی پێدەڵێن کە لەگەڵ (ئازن)دا یەکە.
ئەمانە پاشایانی پاشایانی دیارو ناوداری گوتیەکان بوونە کە پێشینەو ناو و ناوبانگیان بووەتە وێردی سەر زاری وەچەکانی پاش خۆیان..
پاش (گهمورپ)، (جەمشید) بووە بە شاو هەندێ سەرچاوانی مێژوویی (جەمشید) بە برای (گهمورپ کورد) دەزانن. ئەبو حەنیفەی دیناوەری دەڵێت: (جەمشید) نەوەی (ئەرفحشد) بووەو (ئەرفحشد) برای (کیو مرت) بوو. عەجەم بە ئێرانیان گوتووە (ئەرفحشد).
ناوی جەمشید لە ئاوێستادا بە (یم خشیتە) هاتووە. بناغەی ناوەکە (یم)ـە (خشیتە) دەبێ نازناو بێ یا ناوی هۆزو تیرە بێ. کوڕەکەی ناوی (وی

ونگهونت)ـە. لە شوێنەوارە سانسکریتیەکاندا بە (یم وی وسنت) ناوی هاتووەو بە (نەمر) ناسراوە.. بەو قسەیەی ئەبو حەنیفەدا وادیارە ماوەیەك لە نێوان (گهمورپ) و (جەمشید) هەبووەو لەو ماوەیەدا دەسەڵات بە دەستی نەوەو نەتیرەی برایەکانی (کیومرپ) کەوتووە. چونکە عەجەم (بێگانە) بە ئێرانیان گوتووە (ارفحشد) دەبێ لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی وشەی زمانی ئارییان لە زاگرۆسدا بۆ جەمشید بگەڕێین.

لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ ناوی جەمشید وێردی سەر زاران بووەو شوێنێکی مێژوویش لە ئێراندا هەیە پێی دەگوترێ تەختی جەمشید.

سەرچاوە مێژووییەکان دەنووسن: جەمشید بە رادەیەك سنووری دەسەڵاتی خۆی فراوان کردووەتەوە، و دووچاری غرورێکی وەها بووە داوای خوایەتی کردووە، خوا زوحاکی بۆ نازڵ کردووە، سەرچاوەکانی مێژوو تەمەنی جەمشید بە (٧٠٠) ساڵ دەقرسێنن.. دیارە حەوت سەد ساڵ بۆ تەمەنی مرۆڤێك نا ئاساییەو ناچێتە ئەقڵەوە، بۆیە دەبێ ئەم حەوت سەد ساڵە ماوەی دەسەڵاتدارێتی زنجیرە پاشایەك بێ نەك تەمەنی تاقە کەسێك!.

لە تیرەکانی ئێرانی رۆژئاوادا، پاش گۆتیەکان، کوسیەکان ناویان دەرکردووەو ماوەیەکی زۆر (بابل)یان خستووەتە ژێر رکێفی خۆیان و بە هاوکاری گۆتیەکان سنووری ئێرانیان گەیاندبووە سوریا... ئەم تیرەیە لە ساڵی (١٨٩٦ پ.ز) دەستیان بە هێرش بۆ سەر (بابل) کردووە. لە ساڵی (١٧٤٩ پ.ز) (گاندیش)ی پاشای کۆسی دەوڵەتی (بابل)ی لە نێو بردو خۆی ناونا پاشای چوارنکالان. ئەم پاشایە لە ساڵی ١١٧١ پ.ز) بە دەستی پاشای عیلام شکستی هێناو بۆ چیاکانی خۆیان پاشەکشەی کردووە.

دەوڵەتەکەیان کە نێوی (کاردونیاش) بووەو لە میزوپۆتامیا بووە، لە بەین چووە. سی و پێنج نەفەری ئەم تیرەیە لە (بابل)دا پاشایەتیان کردووە. گرنگترین پاشایان (اکوم کاك ریم) بووە کە هەموو ئەو شارانەی هیتیەکان پێشتر لە دەوڵەتی (بابل)یان داگیر کرد بوو، لێی سەندنەوە.

بەم حەساوە (١٨٩٦- ١١٧١= ٧٢٥ ساڵ) واتە ئەم تیرەیە (٧٢٥) حەوت سەدو بیست و پێنج ساڵ حوکمڕانیان کردووە، کە ئەمە نزیکە لە حەوت سەد ساڵەکەی تەمەنی جەمشیدو بەم پێیە (٥٧٨) پێنج سەدو حەفتاو هەشت ساڵ لەبابل ماونەتەوە. بە گوێرەی حیکایەتە پەهلەوییەکان، جەمشید سەد دانە ساڵ بە نهێنی ماوەتەوەو شەش سەدو شازدە ساڵ حوکمی کردووە. (بڕوانە: مجمل التواريخ) کە (٣٨) ساڵی فەرقە لەگەڵ ماوەی دەسەڵاتەکەیان لە بابل. خودانامەی پەهلەوی دەربارەی نەورۆز دەنووسێت: "جەم فەرمانی بە دێوان دا کە تەختێك ئامادە بکەن، تەختەکەیان دروست کرد و خستیانە سەر شانیان و لە دەماوەندەوە بردیان بۆ بابل، خەڵکی کە ئەویان بینی لە ناو کەژاوەکەدا میناکی هەتاو دەدرەوشایەوە، سەرسام بوون، وایان زانی کە هەتاوی ئاسمانەو لە یەك ڕۆژدا دوو هەتاو هەڵهاتووە. ئەم ڕووداوە لە ڕۆژی هورمزدا، کە یەکەم ڕۆژی هەیڤی فەروەردینە، ڕوویداوە. بەم بۆنەیەوە خەڵکی لە دەوری کەژاوەکە خڕبوونەتەوە و هەموو گوتوویانە ئەمە ڕۆژی نوێیە، واتە نەورۆزە!.

بەم ڕوونکردنەوەیەدا ئەوە ساغ دەبێتەوە کە پایتەختی جەمشید (بابل) بووە کە مەڵبەندی دەسەڵاتی کوسی و کاسیتەکان بووە.

لەسەرێڕا نووسراوە کە کاسیتەکان –بەشێك بوونە لە کوسیەکان- لە ساڵی دوو سەدی پێش زایندا، لە شاخەکانی ڕۆژاوای دەریای خەزەرەوە بەرەو

لوڕستان هاتوونەو لەگەڵ کوسیەکانی ئەوێ و بە هاوکاری گوتی و لولوکان پەلاماری (بابل)یان داوە. هەندێ وشەی نوێی ئاریان لەگەڵ خۆدا هێناوەو لە نێو تیرەکانی زاگرۆس دا بڵاوبووەتەوە، یانی ئەوان ناوی ئاریان لە ئێراندا بڵاوکردووەتەوە. ئەمەش دەگەڵ بۆچوونەکەی ئەبو حەنیفەی دیناوریدا کە عەجەم بە (ئەرفحشد)یان گوتووە ئێران تەواو تێك دەکاتەوە. بە گوێرەی نووسینی (دلاپورت) ئەو کوسییە ئاریانەی کە لە بابل دا حوکمڕانیان کردووە، پەیوەندی و پەیوەستەگیان بە قەومی میتانیەوە هەبووە.

سەبارەت بەجیهانگیریی جەمشیدش:

سنووری ڕۆژاوای کوسیەکان پاش داگیرکردنی بابل و ڕاونان و دانە دواوەی هیت و میسرییەکان لەلایەن میتانیەکانەوە، بەنی ئیسرائیلیشی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لە ڕۆژهەڵاتیشەوە، کتێبی (ایران و اهمیتش در ترقی و تمدن بشر) کە لە لایەن زانا (پ.پ. بلسارا)وە نووسراوە دەڵێت: "لە شیکردنەوەی داب و نەریت و ڕوسوماتی ئاینی کۆنی (هیند- ئێران)ەوە دەرکەوتووە کە زۆر پێش داگیر کردنی هیند لەلایەن داریوشەوە پەیوەندی کۆنتر لە نێوان هیند- ئێران هەبووە. بەڵگەی پەیوەندی کۆنی نەژادی هەردووك تیرەکە، لێکچوونی زمان، داب و نەریت، باوەڕ و ڕێورەسمی ئاینیانە. لێکۆڵەرانیش هەموو لەمەدا یەك دەگرنەوە کە ئارياييەکانی هیند لە نزیکەی ساڵی (١٥٠٠ پ.ز) لە ئاریانی ئێران جیا بوونەتەوە، تەنیا زانا (سمیت) نەبێت کە ئەم سەردەمە نزیکتر دەخاتەوەو دەڵێت ئەم جیابوونەوەیە لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پ.زدا ڕوویداوە. کەباسی ئەم ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمە کراوەو، ڕەنگە یەکێك لە تیرەکانی ماد،

بودینـەکان بـووبێ کـە هەنـدێ سەرچـاوەی مێـژوو ئاماژەیـان بـۆ چـوونە هندستانیان کردووە.. ساڵی (١٥٠٠ پ.ز) دەورانی وڵاتگیری کوسیەکان بـووە. دیارە لە رۆژهەڵاتیشەوە چوونەتە هندستانەوە، لە راستیدا سوێند خواردنی نـەجیب زادانـی میتانیـەکانیش بـەخوای (ایندو- اورون) پـشتیوانی ئـەم بۆچوون و لێکدانەوەیەیە.

کتـێبی نێـوبراو لـە میانـەی ئـەو بەڵگانـەوە کـە هێناویەتیـەوە دەڵێـت: "جەمشید لە ئەفسانە کۆنـەکانی ئێرانیانـدا بـە (یمـا) و لـە هندیەکانـدا بـە (یاما) ناوی هاتووەو هەردوولایان بە قارەمانی نەتەوەیی خۆیانی دەژمێـرن. ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیەکە کە جەمـشید پاشایەتی هـەردووك ناوچـەکەی کردووەو بەدەستەوە بووە. بۆیە ئەم فراوانیە لەگەڵ باسی فراوانی سـنووری دەسـەڵاتی جەمـشید لـەو سـەردەمەداو لەگـەڵ وڵاتگیریـی ئـەودا گونجـاوە. هەرتك کتێبی ئـاینی (ڤیـدا، ئاوێـستا) بایـەخی یـەجگار فرەیـان بـەم پاشایە داوەو گەیاندوویانەتـە پلـەی جاویـدانی و نـەمری. لـە شـوێنەوارەکانی سانسکریت دا بە یەکەمین پاشای ئاریان ناسراوە. لە راستیدا لـەو سـەردەم و رۆژگارەدا پاشایانی کاسیت ناوی ئاریان لە دنیادا بەرز کردووەتەوەو بـەر لـە هەموو کەسێك ئاریان بە دنیا ناساندووە.

لـە کۆنـەوە ئـەوەمان بیـستووە کـە جەمـشید، جـەژنی نـەورۆزی داهێنـاوە. ئەگەرچی هەوەڵی ساڵی هەتاوی کە هەمیشە رێکەوتی ئەو رۆژەیە کە هەتاو دەچـێتە بـورجی (حـەمل)ەوە، لـە سـاڵی (٤٧١ کۆچـی)دا عومـەری خـەیام داینـاوە. بـەڵام هـەر لـە کۆنـەوە هـەوەڵی سـاڵ کـراوە بـە جـەژن و عومـەری خەیامیش دەڵێت جەمشید دانەری ئەم جەژنەیە.

لە سەرێڕا باسی پەیدا بوونی نەورۆزم کردبوو، بەر لە ساسانیەکان هەوەڵی ساڵ، لە مانگی میهردا -سەرەتای جەژنی مهرەگانی ئەمڕۆ- دەکرا بە جەژنی نەورۆز، واتە جەژنە سەرەتاوسەری ساڵ. (میهر) لە (میترا)وە هاتووە کە ناوی یەکێك لە خوایەکانی کاسییان بووە.. بەم جەژنەیان دەگوت (میترا) لەگوینە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار بووبێ بە جەژنی (میت) ئەوجا (جەمشیت) و پاشان (جەمشید)و کرداری پاشایانی کوسییان بە ناوی جەمشیدەوە تۆمار کردووە.

وشەی (میترا) لە دوو بڕگە پێکهاتووە، یەکیان (میت) و ئەویتریان (را)یە، لە سیفەتی (زەرتوش را) کە نازناوی پێغەمبەری ئێرانی بووە، خۆیایە (را) بەمانای هەتاو بوو کە ئەمڕۆش کورد (رو)ی پێدەڵێن.

میترا، لە ئاوێستادا فریشتەی روناکی و جەنگو ئیزەدانی گەوردیە (میپ، میت)ش ناوی خوا بووە، کە بەم حەساوە (میترا) دەکاتە خوای هەتاو. قامووسی کتێبی پیرۆزیش وشەی (میترا)ی بە واتای خوای هەتاو لێکداوەتەوە.

ئەو روونکردنەوەیەی کە دەربارەی جەژنی نەورۆز لە خودایناموەوە وەرگیراوە، بەڵگەی ئەمەیە کە جەژنی نێوبراو پەیوەندی بە هەتاوەوە هەیە، (جەمشید)یش نێوی خۆی لەم جەژنەوە وەرگرتووە. خەڵکی کە لە کەژاوەکەدا دیتویانە، بە هەتاویان شوبهاندووەو پێیان گوتووە (میترا) و جەژنەکەشیان ناو ناوە (میترا)، رەنگە هەر ئەم وشەی (میت)ـە بووبێتە سەرچاوەی ئەو ئەفسانەیەی کە جەمشید داوای خوایەتی کردووە. ئەمڕۆش لە نێو کوردا (میت) ناو هەیە کە (متۆ)ی پێدەڵێن.

٢ یا وشەی کاسیت کە ناوی ماڵبات و شۆڕەتی پاشایەك یا ناوی تیرەیەکی کوسەکان بووە، لە وشەی (خشیتە) چوودو پاشان گۆڕاوەو بووە بە (کاسیت، جاسیت، جەمشید).

٣- ئەوەی لە هەموویان دروست تر دێتە بەرچاو ئەوەیە کە ئەو پاشایەی (کاسیت) کە بابلی گرتووە نێوی (گاندیش) بووە. کورد بە تیشك دەڵێن (تیژ، تیش) و هەندێك (تیرێژ)ی پێ دەڵێن... دەبێ لە کۆنیشا (دیش، تیش) بووبێ‌و لە ناوی (کاندیش، فروریتش)ەوە هاتووە. چونکە لە فارسیدا (دیش) بووە بە (شید) و (کاندیش) بووە بە (کان شید) و پاشان بووە بە (جان شید) و بەتێپەڕبوونی رۆژگار (یم خشیتە) لە رووی لیکچوونەوە بە (جەم شید) تەلەفوز کراوە. لەوەیە (گان دیش)، (گیان دیش) بوو بێ کە مانای (روحی تیشك) بووەو هەر بەم بۆنەیەوە جەمشید بە بووەنەوەرێکی نەمر ناسراوە.

راستە کە (یما) چ لێکچوونێکی لەگەڵ (کاندیش) نیە، بەلام دەبێ ئەوە رەچاو بکرێ کە ئەوەی لە کتێبە پیرۆزەکانی ئارییاندا (ئاوێستا و ڤیدا) لەمەڕ (یما) نووسراوە، زۆر جیاوازە لە (جەمشید)ی خوداینامە و شانامە و سەرچاوە مێژووییەکانی دی. زۆربەی ئەفسانە ئێرانیەکانی وەك: جەمشید، زوحاك، فەرەیدون، گرشاسپ.. و، لە ئەفسانانی هندو روم و یەهود و تەنانەت (چین)شدا بەناوی دیکە و ناوانی نزیك لە یەکترەوە هەن. بۆیە ناکرێ ئەمانە بە شێوەیەکی ڕەها بدرێتە پاڵ پاشاکانی ئێران. بۆ نموونە ئەفسانەی (یم و یما)ی هندو ئێرانی، لە یونان پێی دەگوترێ (پلوتو). هەروەها ئەفسانانی هاوشێوەی ئەفسانەی زوحاك لە نووسراوانی یەهودی و مەسیحی دا بەشێوەیەکی دی هەیە.

دەربارەی گرشاسب، زاڵ و ڕۆڵەکانی، جەنابی (سیرکویەجی) لە ساڵی ١٩٢٨دا، وتارێکی لە گۆڤاری (اشیاتیك سوسایتی بنگال)دا نووسیوە و پێی وایە ئەم پاڵەوانانە لە بنەڕەتدا چینی بوونە. نووسەری نێوبراو پاڵەوانە ئەفسانەییەکانی ئێران و چینی بەراورد کردووە و لەم بارەیەوە نووسیویەتی کە ئەفسانەی (گرشاسب)ی ئێران و (yi) کە پاڵەوانێکی چینییە لێکدی دەچن، هەروەها چینیەکان (لی چنگ) و (نوچە)یان هەیە کە لە ڕۆستەم و زۆرابی ئێران دەچن. جەنابی عەباس خان محەمەد عەلی شوشتەری لە بەرگی دووەمی (ایران نامە یا کارنامە ایرانیان در عصر اشکانیان)دا پاش ئەو ڕوونکردنەوەیەی سەرەوە دەنووسێت: ((ئەم جۆرە بەراوردە دەشێت لە نێوان پاڵەوانانی هیند و ئێران، و بگرە (یۆنان و ئێران)شدا بێتە کرن. لێ ناتوانرێ ئەوە دیاری بکرێ کە کامیان پێشتر بووە.))

بەم پێیە وەکو نووسیومە، مێژوونووسان کەسایەتیە مێژووییەکانیان بە پاشا ئەفسانەییەکان شوبهاندووە و مێژوویان ڕێك خستووە.

چونکە پاشایانی ( کاسیت و میتان) واتە کوسیەکان لە هەموو قۆڵێکەوە سنووری دەسەڵاتی خۆیان فراوان کردووە، چونکە کارەکانی ئەوان لە کاری (یم خشیتە) چووە پێیان گوتوون جەمشید و ماوەی وڵاتگیری ئەم تیرەیەیان کە بە ڕاستی نزیکەی حەوت سەد ساڵی خایاندووە، بە تەمەنی جەمشید تۆمار کردووە.

هوم پشت ئاوێستا، دەربارەی ژیانی سەردەمی جەمشید دەنووسێت: (لە سەردەمی پاشایەتی (یما) دا گێتی نە زۆر سارد بووە نە گەرم، لە نێو خەڵکی دا نەپیری هەبووە نە مردن، نە بەغیلی و حەسودیی دەستکردی

شـەیتان هـەبووە. بـاب و کـوڕ کـە پێکـەوە ڕێیـان کـردووە بـە ڕواڵـەت هـەردووکیان وەکـو دوو گـەنجی پـانزە سـاڵان دیـار بوونـە. ئاسـایش و بەختەوەری لە سەردەمی پاشایەتی (یما)دا بەو جۆرە بووە. (بڕوانە: کتێبی مزدیـسنا پـشتها، پـورداود) کتێبـی (ئاوێـستا زەمبادپـشت)ش دەنووسـێت: ((جەمـشید زەمـانێکی زۆر بـە بەختـەوەری و شـادی ژیـا، دەسـەڵاتی بەسـەر حەوت قارەی زەوی و هـەموو بەشـەران و دێوانـدا گـرت تـا لـە ڕاسـتی دوور کەوتەوە و درۆی کرد بە پیشە، ئەو جا فەڕی ئیزەدی لێ دوورکەوتەوەو لـە شێوەی باڵندەیەکدا فڕی و ئاوێتەی خۆر بـوو. جەمـشید پەریـشان و ئـاوارە بوو. لە ئەنجامدا گیرۆدەی ئەژدەهاك بوو. سپیت یورە (spityura)ی برای- بـرای جەمـشید- بەهـەڕە جەمـشیدی لـەتکرد. (بڕوانـە: کتێبـی: مزدیـسنا پشتها, پورداود). لەوەیە ڕووداوەکانیش تاڕادەیەك ئەمەیان سەلماندبێ. واتـە پاش تێشکانی کوسییەکان لە بابل، بەشێوەی پاشاگەردانی کەوتبێتە نێو ئەم میللەتەو براکوژی بەرپابووبێ و دژمن سوودی لەو بارودۆخـە وەرگرتـووە و بە تەواوەتی سەڵتەنەت و دەسەڵاتدارێتی کوسییەکانی لەبەین بردووە.

هـەموو سەرچـاوە مێژووییـە کۆنـەکان لـەو بـاوەڕەدان کـە زوهـاك ئێرانـی نەبووە، بەسەر جەمشید سەرکەتووە و ئێرانی خستووەتە ژێر ڕکێفی خۆی. هەروەها ئەوە نیشان دەدەن کە تەمـەنی زوهـاك هـەزار سـاڵ بـووە. ئەمـەش وەکـو تەمەنەکـەی جەمـشید، دەبـێ مـاوەی دەسـەڵاتی بێگانـان بەسـەر کوسییەکانەوە بێ، کە لە ڕاستیدا ماوەیەکی دیاریکراوی نـەبووە و لـە حـاڵی هەڵکشان و داکشاندا بـووە. هەرچـەند ئـەو پاشـایەی کـە لـە سـاڵی (١١٧١پ.ز) پـەمالاری بـابلی داو بـابلی داگیرکـرد (کـوتیر ناحونتـە) کـوڕی (شـوتروك ناحونتە) بوو، بەڵام ئەو کەسـەی پـاش هاتنـە سـەر تـەخت، عیلامـی خـاکی

کوسیەکانی بە تەواوی داگیر کردو بە یەکجارەکی حکومەتی کوسی لە نێو بردو لە ساڵی (١١٥٤ پ.ز)دا سەڵتەنەت و دەسەڵاتی ئاشورەکانیشی لە نێو برد (شیلهاك ئەینشوشناك)ی برای (کوتیرناحونتە) بوو، کە بوو بوو بە پاشای شوش، کوسی و ئاشور. پاش عیلامیەکان، ئاشوریەکان هێزو توانایەکیان پەیدا کردو کەوتنە پەلاماردانی ئێران. بەم پێیە دەبێ پاشایانی عیلام و ئاشور بە زوحاك بزانین. (شیلهاك ئەینشوشیناك) کە پاشایەتی کوسیەکانی گرتبووە دەستی خۆی بەرەبەرە و بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار لە بەیت و لاوژاندا کورت بووەتەوە و بووە بە (شهاك، شیناك) و لەبەر زوڵم و زۆرداری و چونکە (شهاك) لە (زهاك، زیاك) چووە، گۆڕاوە بۆ (زهاك-شیناك) و پاشان بووە بە (زهاك شونەك) کە لە کوردیدا بە واتای (ئەژدیهای سەر شان دێت).

کورد تا ئەمڕۆش بە ئەژدیها دەڵێن: (زها، زیا) و (زهاك) واتا یەك ئەژدیها و (شونەك)ش لە کوردیدا بە یەك شان دەگوترێ. ئیدی بەمجۆرە ئەفسانەی مارەکانی سەر شانی زوحاك دروستبووە. تا ئەمڕۆش ئەگەر کورد بیانەوێ وەسفی کەسێکی موزیرڕ بکەن دەڵێن: مرۆڤ نییە، زوهاکە، یانی بەشەر نییە، ئەژدیهایە، ماری گەورەیە. جا چونکە ئەو سوڵتانە بێگانانە لە زوڵم و زۆرداری دا پێشبرکێی یەکتریان دەکرد، میللەت بە هەر هەموویانی گوتووە (زهاك) واتە ئەژدیها. لە راستیدا زوڵم و زۆری پاشایانی ئاشورش لە مێژوودا خویایە. گاڤێ بەسەر دژمندا سەرکەوتبان، لە کەللە سەری بڕاوی دیلان، ئەگەر ژن و منداڵیش بوایەن چەندین قەڵایان دروستکردووەو تەڕیان بڕیوەتەوەو وشکیان سووتاندووە، هەر کەسێکیش لە قەتڵ و عام دەرباز بوایە لەگەڵ پەزو ماڵاتدا بەدیلی دەیانبرد.

بۆ نموونـه ئاشـور پانیپـاڵ پـاش داگیر کردنـی ئـیلام نووسـیویەتی:
"خاکی شاری شوشان، شاری ماداکو" و شارانی دیکەم بە تەواوی هێنایە ژێـر رکێفی ئاشوریان و لە ماوەی یەك مانگ و یەك رۆژدا هـەموو وڵاتـی ئـیلامم داگیر کردو گسکم لێدا. من ئەم وڵاتەم لە تێپەڕینی پـەزو مـاڵات و تەنانـەت ئاوازی مۆسیقاش مەحروم کردو رێگەم بە درِندەو مارو جانەوەران و ئاسکی دەشت دا کە بۆ خۆ ئاوەدانی بکەنەوە...".

پاشـایانی ئاشـور لـە کەتیبـەو بەردەنووسـەکانی خۆیانـدا شـانازی بـەوەوە دەکـەن کـە زمـانی هـەزاران دیلیـان دەرهێنـاوە و چـەندین تەپـەو گردیــان لــە کەللەســەری بــڕدراو دروســتکردووە. ئــەم پاشــایانە منــداڵی دیلەکانیان لە ئاوردا دەسوتاند.

دیارە هەر بە هۆی ئەم دڵڕەقی و رەفتارە زبرو تواندنەوە بـووە کـە بـە ژمارەیـەکی کەمـەوە هاتوونەتـە وڵاتـی گوتیـەکان، و خـەڵکی ناوچـە داگیرکراوەکـەیان کـردووە بـە پاشـکۆی خۆیـان و ملیـان پـێ کەچـکردوون. سەرچاوانی مێژوو، مەڵبەندی زوحاك بە (بابل) دەزانن و لـە راسـتیا پاشـای ئـیلام لـە بابـل، دەوڵـەتی (کاردونیـاش)ی لـە نێـو بـردووەو ئـەم مەڵبەنـدە مێژووییە گرنگەی داگیرکردووە.

بەمەدا بە دیار دەکەوێ کە میللـەتی ئێـران لـە سەردەمی زوحاکدا کوسییەکان بوونە. جا چونکە شانامەش، کوردەکـان بـە میللـەتی جەمـشید دەزانێ و ئەم بۆچوونەش لەگەڵ بۆچوونی ئەو توێژەرانەدا کـە کوسـییەکان بە باپیرانی کورد دەزانن، تێك دەکاتەوە، شانامە دەربارەی کوردەکان دەڵێت:

(رەوا بوو هەر شەوێ دوو پیاوی گەنج —ج گەداو چ پاڵەوان، ئاشپەز دەیبردە دەرباری شا- دەیکردن بە دەرمانی چارەی شا، دەیکوشتن و مێشکی دەردەهێنان دەیکردنە خۆراکی ئەژدیها...).

ئەرمایل و کەرمایل، دوو وەزیری زوحاك بوون، ئەمانە چارەیەکیان دۆزییەوە، هەموو جارێ یەك لەو دوو لاوەیان ئازاد دەکردو رەوانەی کێویان دەکرد و لە جیاتی مێشکی ئەو، مێشکی مەرێکیان دادەناو بەو لاوەیان دەگوت: (وریابن لە ئاوەدانیان نەبن —هەر کێوو دەشتە بەشتان، بەمجۆرە هەر مانگێ سی لاو- لەو لاوانە دەبوو رزگاریان، کە بوون بە دووسەد —ئیدی کەس نەی دەناسین، ئاشپەز برێ مەرو بزنی دانێ- و رێی دەشتیان گرتە بەر، کوردی ئێستا نەوەی ئەوانەن —و بیری ئاوەدانی ناکەن، ماڵ و سامانیان پەلاسە- چاو قایمن لە خواش ناترسن.)

شانامە دەڵێت کاوەی ئاسنگەر ڕاپەڕی، زوحاکی کوشت و فەریدەوونی کرد بە پاشا.

عومەری کوڕی خەیام، لە نەورۆزنامەکەی خۆیدا دەڵێ فەرمیدونی کورد، ئەو رۆژەی کە زوحاکی بەدیل گرت، ئێرانی لە شەڕی ئەو خەلەساندو ئەو رۆژەیان کرد بە جەژن.

(موریەر) نزیکەی سەدو پەنجا ساڵێك لەوە پێشتر نووسیویەتی: "لە رۆژی ٨/٣١دا خەڵکی دەماوەند بە یادی رزگار بوونی ئێرانیان لە زوڵم و زۆری زوحاك، جەژنیان گرتووەو بەم جەژنەیان گوتووە (جەژنی کوردی) ئەم ناوە بەڵگەیە کە میللەتی ئێرانی سەردەمی جەمشید و زوحاك باپیرانی کوردەکان بوونەو (دەماوەندییەکانیش کە باوباپیرانی خۆیان بە کورد

زانیوه. ناوی ئەم جەژنەیان لە باوانەوە بۆ ماوەتەوە و پێیان گوتووە جەژنی کورد.

(عەلی ئەسغەری شەمیم هەمەدانی)ی نووسەری کتێبی کوردستان، لە کتێبەکەی خۆیدا دەڵێت: "لە نێو کوردانی باکووریی ئێراندا جەژنێك هەیە بە ناوی (جەژنی کوردی) کە بە رێورەسمی تایبەتی و بە یادی نەمانی زوڵمی زوحاك و گیرۆدە بوونی بە دەستی فەرەیدوون، بەرپا دەکرێت. رەنگە ئەمە بەڵگەیەك بێ بۆ دروستی نووسینەکانی ناو شانامە".

لە کوردستانی تورکیاشدا ئەم جەژنە دەگێڕدرێت و جەژنی (تول دان)ی پێدەڵێن. (تول دان) سووك کراوەی (تول هەڵدان)ە کە لە زمانی کوردیدا بە مانای تۆڵە ئەستاندنە. واتە ئەو رۆژەی کە تۆڵەی خۆیان لە داگیرکەرانی تەخت و تاجی میللەتی خۆی وەرگرتووە. یانی حاکمی بێگانە بە دەستی سەرۆکەکەیان —ئێمە پێی دەڵێین فەرەیدوون- گرفتار بووە جەژن دەگێڕن و ناوی جەژنەکەشیان بە زمانی خۆیان ناوناوە (تول هەڵدان).

پاش ئیسلام بۆ وەی لەگەڵ ئاینە تازەکەیان بگونجێ پێیان گوتووە (خدر پێغەمبەر) چونکە حەزرەتی خدر لە کاتی سەختی و دژواریدا بە فریارەس ناسراوەو وایان تەسەور کردووە لەو شەڕی تۆڵە سەندنەدا فریایان کەوتووەو یارمەتی داون.

لەو شەوەدا، لە هەمووماڵێکا بۆ رێزگرتنی فریارەس دوو چرا هەڵدەکرێ و تا بەیانی ناکوژێنرێتەوە تا فریارەسەکە سەریان بداو فەڕو بەرەکەت بە ماڵەکە ببەخشێت. ئەرمەنیش کە هاوخاکی کوردستان بوونە لەگەڵ کوردەکانداو لە هەمان رۆژدا ئەم جەژنە دەگێڕن. تەقویمەکانی

ئەرمەنی بەوە دەڵێن (دیانت ئاراج) و عەوام پێی دەڵێن (گرانداز) و بە جەژنی ئێزیدیانی کوردی دەزانن. (ئێزیدی) تیرەیەکی کوردە کە پتر لە تیرەکانی دی پابەندی بیروباوەڕی ئاینی کۆنی خۆیانن. کوردەکان بە خۆشیان بەم تیرەیە دەڵێن (ئێزیدی) و میللەتانی دی وشەکەیان شێواندووەو (یەزیدی)یان پێ دەڵێن. مەڵبەندی ئەم تیرەیە سنجارە، کە کەوتووەتە باکووری رۆژاوای شاری موسڵ و یەکێکە لە قەزاکانی ئەم شارە. کوردەکان پێی دەڵێن (شنگار). قاموسی کتێبی پیرۆز ئەوە نیشان دەدا کە بابل ناوی شنغار بووەو شوێنی نەمرود بووە.

ئینگلیزەکان لە ساڵانی ١٩٢٤- ١٩٢٥دا لەسەر مەسەلەی موسڵ لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا کێشەیان هەبوو. چارەسەری مەسەلەکەیان بە کۆمەڵەی نەتەوەکان سپاردو شاندێك لە نوێنەرانی دەوڵەتانی بێلایەن کرا بە سەرپەرشتیاری چارەسەری مەسەلەکە. قەرار بوو کە مەسەلەکە بە گوێرەی حەزو ویستی دانیشتوانی دەڤەرەکە چارەسەر بکرێ. وەفدەکە پاش گەڕان بە نێو خەڵکەکەدا و وەرگرتنی راوبۆچوونی دانیشتوانی ناوچەکە لە ١٩٢٥/٧/١٦دا راپۆری خۆی دایە لایەنانی پەیوەندیدار. لەو راپۆرەدا دەربارەی ئێزیدیەکانی ئاکنجی شاری شەنگار نووسی بوویان: "ئێزیدیەکان باوەڕیان وایە لە بەهەشتدا بە کوردی قسە دەکرێت، خوا قورئانی پیرۆزی بە کوردی ناردووەتە خوارەوەو محەمەد دروودی خوای لێ بێ بە عارەبی بلاوی کردووەتەوە. ئەم تیرەیە بە زمانی کوردی عیبادەتی خۆ دەکەن...".

شاپووری یەکەم لە بەردەنووسێکدا کە لە حاجی ئاوا دۆزراوەتەوە بەمجۆرە باسی خۆی دەکات: "من هرمز شاپووری خوا پەرستی رۆڵەی خوام

و شاهنشای ئێران و (واتیران) که ئەم جەژنی (تول دان)ـە لە عێڵی کرمانج (چارگها) باشتر دەگێڕین.."

لە کوردستانی باکووردا، لەو شەوەدا، هەر کەسەو لەسەر بانی ماڵی خۆی، یا لە شوێنێکی بەرزدا ئاگر دەکەنەوە. ئەو دارە درێژو وشکانەی کە بۆ ئەم بۆنەیە ئامادەی دەکەن، سەرێکی لە نەت یا رۆنگەرچەك هەڵدەکێشن و ئاگری پێوە دەنەن، و سەرەکەی تری بە دەستەوە دەگرن و بە چوار دەوری خۆیانا بای دەدەن و دەیسوڕێنن. بەم رەفتارانە دەردەخرێت کە کودەتایەك دژی زوحاك کراوە. ئاگر کردنەوە لەسەر بان و سوڕاندن و بادانی ئاگرەکەش نیشانەی راگەیاندنی راپەڕین بووە.. چونکە لە کۆندا دەزگای پەیوەندی خێرای میناکی تەلەفۆن و تەلەگراف نەبووە، بۆیە لە جیاتی ئەو دەزگایانە لە شوێنی بەرزدا ئاگریان دەکردەوە. کە گەرەکیان بوایە لە یەك کاتدا کارێك لە هەموو وڵاتدا ئەنجام بدەن، دیدەوانی مەرکەزی شار ئاگری هەڵدەکردو دیدەوانی شارۆچکەو دێهاتەکان هەمان کاریان دەکردو بەمە یەکتریان ئاگادار دەکردەوە.

لە سەردەمی حکومەتی مەروانیەکاندا عێڵی زیلان کە زوڵم و زۆری حاکمانی مەروانی پەرێشانی کردبوون، بۆ لە نێو بردنی ئەوان ــوانە مەروانیەکان- هەمان کاریان لەگەڵ کردن کە (هوخشترە) دەرهەق بە سەرانی سکائانی کردبوو. یانی ئەوانیان، کە هەشتا سوارە بوون و هاتبوون سەردانی عێڵی زیلان بکەن، لە ماڵەکاندا دایان مەزراندن و بە گوێرەی قەرارێکی بەینی خۆیان، شەوێ لە سەر بانی ماڵی سەرۆك عێڵ، لێفەبەکیان لە رۆنگەرچەك هەڵکێشا بوو و ئاگریان تێ بەردا بوو. هەر کە ئاگرەکە بینرا، هەر کەسەو لە ماڵی خۆیدا میوانەکەی خۆی کوشت و لە ئاگری

سێیەمدا هەموو باریان کردو بەرەو باکوور کۆچیان کرد. خودی حاکمیش کە لەماڵی سەرۆك عێڵ دەبێت، وەختێ دەیانەوێ بیکوژن، خۆی دە عەماری ئازوقە دەهاوێ و لەوێندەر دەیگرن و دەیکوژن. هەر لەبەر ئەمەیە ماڵباتی سەرانی زیلان تا ئەمڕۆش هەر (کولین بە خوێن)یان پێدەڵێن.

بەر لە یەکەم جەنگی جیهانی، لە ڕۆژی ٢/١٤دا کە ڕێکەوتی ١٢/١٨ی هەتاویە، جەژنی (تول دان)یان دەگێڕا، ئێستا لە ١١/٢٥ی هەتاویدا ئەو جەژنە دەگێڕن. هۆیەکەشی ئەمەیە کە دەوڵەتی عوسمانی تاریخی رومی بەکار دەهێنا کە دوانزە ڕۆژ لە دوای تاریخی فەڕەنگی بوو. لە سەردەمی یەکەم جەنگی جیهاندا، بۆ ئەوەی لەگەڵ دۆستەکانی خۆیدا: ئەڵمان و نەمسا، لە مێژووەکاندا بە هەڵە نەچن، مێژووی فەڕەنگی ئەوروپایی قەبوڵ کردو سیازدە ڕۆژی هێنایە پێشەوەو ڕێکەوتی ٢/١٤ و ١٥ی بەهمەن بووەوە.

سەبارەت بە جیاوازی زۆری ڕۆژی (جەژنی کورد)ی دەماوەند و جەژنی (تولْ دان)ی کرمانج، دەبێ بگوترێ کە دەماوەندیەکان کە لە ڕۆژی ٨/٣١ جەژنیان دەگێڕا، ئەم ڕۆژە ڕێکەوتی ٦/٩ ی هەتاوییەو لە جەژنی نەرووزی کۆن کە لە ٧/١ی هەتاوی بووە، بیست و دوو ڕۆژ پێشتر بووە، واتە ڕێکەوتی سەرەتاکانی دوا مانگی ساڵ بووە.جەژنی (تول دان)ی کرمانج کە لە ١٢/٨ی هەتاوی بووە، بە حەساوی ئەمڕۆ دیسان بیست و یەك، بیست و دوو ڕۆژ بەر لە جەژنی نەورۆزە. واتە ئەمیش ڕێکەوتی سەرەتاکانی دوا مانگی ساڵ دەکات.

لە سەردەمی کۆندا حیسابێکی وردو ڕێکوپێکی لە کایەدا نەبووە. جەژنی سەرکەوتنی (فەرەیدوون)یان بە بیست و یەك ڕۆژ بەر لە سەری ساڵ دەزانی. بەرانبەر بە گواستنەوەی جەژنی سەری ساڵ بۆ مانگی یەکی

سـاڵی هـەتاوی، جـەژنی (تـول دان)یـش گوازراوەتـەوە بـۆ مـانگی دوانـزەی هـەتاوی، دیـسان بیـست و یـەك رۆژ كەوتووەتـە پـێش جـەژنی نـەورۆزەوە. چونكە بەڵگە و ئاسەوارەكانی پەهلەوی ئـەوە نیشاندەدەن جـەژنی گـەورەی میهرەگان بـە یـادی سـەركەوتنی فەرەیـدوون بەسـەر زوحـاك دا بـووە، بۆیـە دەشێت بگوترێ كە لە سایەی تێپەڕ بوونی رۆژگارو گۆڕانی مێـژووی سـەری ساڵ، ئەم جەژنە میللییەی كوردیش گۆڕانی بەسەر هاتووەو ئـەو سـەركەتنە گەورەیـەی ئاریـانی (ئێرانـی) رەنگـە لـە هـەیڤی شـەش و حـەوتی هەتاویـدا بووبێ.

جەژنی (دەرا مەزنان)یش كە لە شـەوی ١٦/١٠ی هەتاویـدا بـەرپایان دەكرد، بۆ سەردەمی فەرەیدوون گەڕاندووتـەوە. (دەرا مـەزنان) زاراوەیـەكی كوردیە و بە مانای (دەرگای گەورەكان) دێت. زەردەشتیەكان لە رۆژی ١٠/١١ی هەتاویـدا، وەخـتی زەردەپـەڕی خـۆراوا ئـاگرێكی گـەورە دەكەنـەوەو جـەژن دەگرن. ئەم جەژنە ناوی (سـدە)یـە. بـە بـاوەڕی پارسیانی كـۆن لـەم رۆژەدا هوشـەنگ ئـاگری دۆزیوەتـەوە، هـەروەها لـەو رۆژەدا بـووە كـە فەرەیـدوونی كـورد بەسـەر زوحاكـدا سـەركەوتووە. نزیكـەی یـەك مـانگ فـەرق هەیـە لـە نێوان تاریخی زەردەشتیەكان و جەژنی (تول دان)دا. جگـە لـەوەی كوردەكـان تەنیا (جەژنی تول دان)ی پێدەڵێن، بەڵام زەردەشتیەكان ئـەم رۆژە هـەم بـە رۆژی دۆزینـەوەی ئـاگر لەلایـەن هوشـەنگەوەو هـەم بـە رۆژی سـەركەوتنی فەرەیدوونیشی دەزانن.

لـە رۆژی جـەژنی (تـول دان)دا كوردەكـان دەچـنە مـاڵی یەكـدی و پیرۆزبایی لێكدی دەكەن. لەوەیە ئەم جەژنی (تـول دان)و (جـەژنی كـورد)ی دەماوەندەكان بەو بۆنەیەوە بێ كە (هوخشتر)ی پاشای ماد لـە یـەك شـەودا

هەموو سەرانی سکایەکانی لە نێو بردو وڵات و دەسەڵاتی خۆی لە دەستی وان رزگار کرد.

مەسەلەی کاوەی ئاسنگەریش هەم لەم جەژنەوەو هەم لە درەفشی کاویانیەوە، کە لە جەنگی قادسیەدا فەرمانەدەی عارەب، سەعدی کوڕی وەقاس لە دەستی ئێرانیەکانی دەرهێناوەو داویەتیەوە بە خەلیفە، دەردەکەوێ کە بنەمایەکی هەیە. ئارامیەکان لەو ساڵانەدا هاتبوونە ئاشورستان و ئێرانیەکانیش سوودیان لەمە بینیوەو بە کودەتایەك ئاشورییەکانیان لە نێو خۆیاندا دەرپەڕاندوەوە. بە هەر حاڵ تۆڵەیەکی چاکیان سەندووەتەوە کە نەوەکانیان، واتە میللەتی کورد ئەو جەژنە تا ئەمڕۆش دەگێڕن و ناویشیان ناوە جەژنی (تولە سەندن).

فیردەوسی دەربارەی رەگورەچەڵەکی (فەردیدوون) لە زمانی داکی فەرەیدوونەوە دەڵێت: "تۆ بزانە لەسەر زەمینی ئێران —پیاوێك هەبوو بە ناوی ئابتین، و ریاو لە رەچەڵەکی پاشایانی کیان بوو- پاڵەوانێکی زرینگ و بێ ئازار بوو، لە رەچەڵەکی تهمورپی کوردی بوو- باب و باپیرانی خۆی دەناسین".

لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە نەوەی داپیزیری پاشای گوتی بووە، بەم حیسابە فەرەیدوون کوڕ یا نەوەی جەمشید نەبووە. واتە لە بنەماڵەی پاشایانی کاسیت نیە.

* * *

ناوی فەرەیدوون لە ئاوێستادا (ترایتیون) لە (ڤیدا)دا (ترایی تنە)یە. لە نووسراوانی پەهلەوی دا بە (فریتون) تۆمار کراوە. ئاوێستا نیشتمانی

(ترایتیون) بـه (ڤـرن) دەزانـێ و مێژوونووسـان (ڤـرن) بـه دیلمـان، گـەیلان زانیوه.

کتێبـه کۆنـەکان، مازنـدەران بـەجێی دێـوانی یـاخی دەزانـن و تەنانـەت لـه (مینـورك خـرت)دا راگەیـەنراوە کـه "فەرەیـدون" پـاش گـرتنی زوحـاك، لـه دێوەکانی مازندەرانی داوەو له وڵاتی (خنیرس) وەدەری ناون.

لـه کوردسـتانی تورکیـادا، قەڵایـەکی کـۆن هەیـه تـا ئـەمرۆش هـەر نـاوی (خنس)ـه، کەوتووەته نزیکی موش- مەڵبەندی موشکییەکان- که کەوتووەته بەشی رۆژئاوای دەریاچەی هیوسرەوە، واتـه دەریاچـەی –وان- تـۆ بڵێـی ئـەم ناوه (خنیس) له (خنیرس)ەوە هاتبێ و (خـنس)ش لـه دەوروبـەری دەریـای خەزەر نەبووبێ‌و له دەوروبەری دەریاچەی وان بووبێ؟!.

له ئاوێستادا درۆ پەرستانی ڤـرن (ورن) کـه لـه وڵاتـی دینـم، گـەیلان بوونـه لەگەڵ دێـوانی مازنـدەران دا واتـه موشـرکینی مازندەرانـدا لـه یـەك شـوێندا ناوبراوە. به گوێرەی ئاوێستا وا دەردەکەوێ که لـەم دوو وڵاتـەدا دەستەیەك لەسەر ئاینی کۆنی خۆیـان ماونەتەوەوپـەیرەوی ئـاینی زەردەشـتی نەبوونـه. (بڕوانـه: ادبیـات مزدیـسنا پـشتها). زۆر زەحمەتـه ئـەوە قبـوڵ بکـرێ کـه زەردەشـت، فەرەیـدوونی بـه درۆ پەرسـتانی (ڤـرن) و هاوتـای موشـرکینی مازندەران زانی بێ.

له کۆنا، شوێنی کۆشکی زستانەی پاشایانی ئازربایجان پێی گوتراوە ڤرا (ورا) کـه لـه (ڤـرن= ورن) دەچـێت. ئەمـەش نزیکـه لـه قەڵـەمڕەوی دەسـەڵاتی (ئیرەج)ی کوڕی که دواتر باسی لێوە دەکەین. دارمیس تیتر باوەڕی وایـه کـه (پێـشینانی بنەماڵـەی ئەتویـه خـەڵکێکی جووتیـار بوونـه، چـونکه نـاوی زۆربەیان به پاشگری گا تەواو دەبێ (له ئاوێستادا گیو) وە.

(کتزیاس)ی مێژوونووس کە لە ساڵی (٤١٠ پ.ز) هاتووەتە دەربارى ئێران و دکتۆری ئەردەشیری دووەم بووە، ئەوە نیشاندەدا کە فەرەیدوون ناوی (ئاریاکیس) بووەو یەکەم پاشای ماد بووە. مێژوونووسانی رۆژاوا دەڵێن: (فەرەیدوون) ناوی (ئاریاس) بووەو لە تیرەی (ماد)ە.
بەپێی نووسراوەکانی ئاشور، یەکەم پاشای ماد (فرورتیش)ـە هەردووك وشەی (فرورتیش) و (فریتون) لێکتر دەچن. مێژوونووسانی رۆژاوا پێیان وایە کە (ئاریاس- فەرەید.وون) نەینەوای گرتووە، حاڵبوکی ئەم فەتحە مێژووییە گرینگە بە دەستی (هوخشترەی) کوڕی (فرورتیش) ئەنجام دراوە. هەر چەند بە گوتەی هیرودت (فرایورتیس) یەکەم هێرشی کردووەتە سەر ئاشور و لە کاتی پەلاماردانی شارێکی سنووریی ئاشوردا مردووە (٦٥٣ پ.ز) و ئیدی رەعیەتەکەی لە ئەشکەوتێکی ناو کۆجارەکانی کوردستاندا، لە گۆڕیان ناوە.
رەشید یاسمی رەحمەتی دەنووسێت: بەپێی لێکۆڵینەوەی زانایان دەبێ گۆڕەکەی لە یەکێك لەم شوێنانە بێ:
١- زەهاوی کرماشان، نزیکی بەردەنووسەکەی ئانوبانی نی پاشای لولوبیوم.
٢-نزیکی بێستون.
٣-باکووری شارەزوور
٤- باشووری دەریاچەی ورمێ.
هەڵبەتە ناکرێت بە دڵنیاییەوە یەکێك لەو شوێنانە هەڵبژێردرێت. ئەوەی بەڵگەنەویستە هەر هەموو ئەوانە هی سەردەمی پێش دەوڵەتی هەخامەنشییە. (بڕوانە کتێبی: کرد، پیوستگی نژادی و تاریخی او).

نازنـاوی (فـرورتیش- فرایـورتیس)، (هوخـشتریته) بـووه. ئاشـوریەکان (گشتاریتی)یان پێدەگوت. هەر لەبەر ئەمەیە ئەم مێژوونووسانەی رۆژاوا (هوخـشترە)یـان لەگـەل (هوخـشتریته)دا تێکـەڵ کـردووە. هـەروەها مێژوونووسان (فرائورتیس)یان لێ بووە بە (ترایتنه) و بە (فەرەیدوون)یان زانیوە. لە راستیدا پاش دەسەڵاتی گوتی و کوسیەکان (فرورتیس)، یەکەم کەسـە کـە بـە گـرتنی پـارس، ئێرانیـەکانی یـەك خـستووەو لـە ئێرانـدا دەوڵەتێکی بە دەسەڵاتی دامەزراندووەو ئاشورییەکانی لـە ناوچەی زاگـرۆس جـێ لـەق کـردووە. کردارەکـانی (فـرورتیش) هـاو شـێوەی کردارەکـانی فەرەیدوونە.

ناوی زۆربەی بنەماڵەی (فـرورتیس) بـە پاشـگری (گیـو، گـاو) دروسـتبووە، وەك: ئـەختوریگیو، دیـاکو... کـە دارمـیس تـیتر لـە بـارەی بنەماڵـەی (ئەتویە)وە تۆماری دەکات. وەك پێشتریش روونم کردبووەوە، گا تـەنیا لـە کشتوکاڵ بـەکار نـەدەهێنرا، چونکە تیرەکانی ماد گاگەلی زۆریـان هـەبووە. تەنانـەت ئاوێـستاش بـە جـۆرێ باسـی (یـم و ترایتیـون- جەمـشید و فەرەیدوون- دەکات کە خاوەنی گاگەلی زۆر بوونـەو بـە ناچاری گـەرمیان و کوێستانیان دەکردو هەندێ جار لـەم کـۆچ و کۆچبەریەدا زۆریـان پێدەچوو لە کۆجاڕانی سەخت و تووش و دەشتەکاندا. بەهێزترین هۆی گواستنەوەیان وەك ئەمرۆی کوردەکان، بە زۆری گا بووە.

لەم حاڵەتەدا، ئەوە دروست دێتە بەرچاو کە جەژنی (تـول دان یـان جـەژنی کوردی) بە بۆنەی سەرکەوتنی (هوخشترە) بەسەر سکایەکاندا بووبێ:

لە سـەردەمی دیاکۆی پاشای مـادا، واتـە لـە سـەردتاکانی سـەدەی حەوتـەمی پ.ز، کیمرییەکان کەتیرەیەکی شەڕڤان، ئـازاو چـالاك بـوون، لـە قـەوقازەوە

نشێوبوونەتەوە و لە خاکی ماننائیدا جێگۆرکێیان کردووەو دوای ئەوان جەماعەتێك لە سیتەکان (ئیشکوزائی)یەکان هاتوون. ئەمانیش چەکداری نەترس بوون و لە تالآن و بڕۆو شەڕو شۆڕدا بەسەرامەدی ڕۆژگاری خۆیان حەساو دەکران. بەردەنووسێك لە پاش پاشایانی ئاشور: ئاسەرهادون و کوڕەکەی بەجێماوە، بەدیاری دەخات کە ئەوانە چ جەزرەبەیەکیان لەماننایییەکان نەداوە، بەڵکو لەگەڵ ئەواندا یەکیان گرتووەو دژی ئاشوریەکان وەستاون. یانی لەو سەردەمەدا کە (ئەهشری) میری ماننایییەکان بەرانبەر بە ئاشورییەکان ئاڵای یاخی بوونی هەڵکردبوو، لەشکری ئاشوری کە هاتبوو بۆ سەرکوتکردنی (ئەهشری) لەلایەن تیرەی کیمرییەوە پەلامار دراوە. هەر چەند ئەم پاشایە -ئاسەرهادون- دەڵێت مانناییەکانی تەفرو تونا کردووەو هاوکارەکانیانی (واتە ئەشپاکایاسکایەکان)ی بنبڕ کردووە. بەڵام بەپێی بەردەنووسێك کە لە پاش کوڕەکەی ئاسەرهادون بەجێماوە دەردەکەوێ (ئەهشری) چەندین ساڵ پاش ئەم ڕووداوەش هێشتا هەر یاخی بووەوتەنانەت ماننایییەکان لەسەردەمی ئاسەرهادون شاری (شروایکبی)یان گرتووە. پاشانیش (فرایورتیس)ی پاشای ماد بە هاوکاری ئەو هۆزانە دەستی بە دەرکردنی ئاشوریەکان لە زاگرۆس کردووە. چونکە سکایەکان پاش (فرائورتیس) کنەیان لە دەوڵەتی ماد کردو لاوازیان کرد. (هوخشترە)ی کوڕی فرایورتیس کە هاتە سەر تەخت و لە جێی بابی دانیشت، شەوێك هەموو سەرانی سکایەکانی کوشت و وڵاتی لە شەڕی وان رزگار کرد، (بڕوانە کتێبی: کرد، پیوستگی نژدای و تاریخی او). چونکە (فرائورت) یان بە فەرەیدوون زانیوەو شۆرەت و لەقەبی (فرائورت)ش (خشتریت) بووە. زۆر نزیکە ئەم ڕووداوەیان لەگەڵ ڕووداوی کوشتنی زوحاك بە دەستی

**فەرمیــدوون، تیکــەڵ کردبــێو جــەژنی (تــول دان) و (جــەژنی کــوردی) دەماوەندییــەکانیش‌یــان بــە جــەژنی گــیرۆدە بــوونی زوحــاك بــە دەســتی فەرمیدوون زانیوە.**

**پاشماوەی سکایەکان لـه نێـو مادەکـان دا بڵاوبوونەتـەوەو پاشـان بـوون بـه کورد. له هەموو حاڵێکا (فرایورتیس)ی (ماد) نـه (ترایتیـون)ی ئاوێستایەو نــه (ترایـی تنــه)ی ڤیدایـه. بـەڵام ئـەو کـردارو وەسـفانەی مێـژوو لەمــەر فەرەیـدوونی تۆمـار کـردوون، لەویـشدا هـەن و ناودکەشـی لـه (غریتـون) دەچێت، به هەر حاڵ نووسەرانێ لـەزاری ئـەو دەنگبێـژو حیکایەتخوانانـەوە که به (فرایورتیس)یاندا هەلگوتووە، به (ترایتیون)یان گوتـووە (فـەریتون). ئەگـەر بـەمجۆرە بـێ ئـەوا پـاش‌و پێـشێك لـه مێـژووی دەسـەڵاتی پاشاکاندا روویداوە. شانامه دەڵێت: فەرەیدوون قەڵەمرەوەکەی خۆی بەسەر هـەر سێ کوڕەکەیـدا دابـەش کـرد. رۆژهـەڵاتی دا بـه (تـور) و رۆژاوای دا بـه (سـلم)و ئێران- که لـه ناوەڕاستا بـوو-دا بـه (ئیرەج). (تـور وسـلم) حەسـوودیان بـه ئیرەج برد، چوونه سەری و کوشتیان.**

**له کتێبی (دین کرد) ناوی ئەم پاشابه به (ئیرەج) هاتووە. ناوی (سلم)یش لـه ئاوێـستادا (سـئیریم)ـه. (مـارکوارت)ی رۆژهـەڵاتناس ئـەم نـاوە بـه تـیرەی (سرمت) دەزانێ که ئارییایی نەژاد بوونەو له نێوان رووباری ڤۆلگا- دەریاچەی ئورالدا دەژیان، ئەم تیرەیه چادرنشین بوونەو گوێیان بە فەلاحەتی نـەداوەو ژیارو شارستانیەتیان نەبووە. هەندێ له مێژوونووسانی ئێران و رۆم دەڵێن: مادەکـان خۆیـان بـه خزمـی (سـەرمت) دەزانـن.لێکۆڵـەران، (تـور)یش بـه سـاکاییەکان دەزانـن، کـه سـنووریان لـه رۆژهەڵاتـەوە تورکـستانی چـین،**

مەغولستان بووە، لە ڕۆژاواوە دەریای مازندەران بووە، لە باشووریشەوە ئەفغانستان و ئێرانی ئێستا بووە.

مامۆستای بەڕێز، جەنابی پورداود لە کتێبی: (ادبیات مزدیسنا پشتها)دا: لەم بارەیەوە هەندێ ڕوونکردنەوەی خستۆتە بەردەست و دەڵێت: تۆرانیەکان ئێرانی نەژاد بوونەو بە هەڵە بە تورکەکان کە مەغۆلی ڕەگەزن، دەگوترێ تۆرانی.

بەڵام سەبارەت بە (سلم و تور)ی (خودای نامك) ی پەهلەوی و شانامە، دەبێ بگوترێ ئەمانە کەسایەتی مێژوویین و چ پەیوەندییەکیان بە (سئیرم وتور)ی ئاوێستاوە نیە.

لە نووسراوەکانی ئاشورەوە ئەوە بە دیار دەکەوێ کە دەوڵەتی ئاشور چەند ساڵ پێشتر وڵاتەکەیان لەلایەن ئارامیەکان داگیر کرابوو، خۆیان لە ژێر ڕکێفی ئەوان خەلەساندو پاشای نێوداریان (ئاتونازیرپال) لە ساڵی ٨٨٤ پ.ز) پەلاماری ئێرانی داو سنووری (تیکلات پلیسر)ی داگیر کرد. پاشان (سلم نصر) لەشکری کردە سەر ئێران. دوور نییە ئەم دوو پاشایەی ئاشور (ئاتورنازیر پال و سلم نصر)، (تور و سلم) نەبووبن کە پاشان مێژوونووسان بە کۆڕانی (ترایتیون)ی ئاوێستایان شوبهاندوون و پێیان گوتراوە (تورو سلم) و ئەفسانەیان بۆ هەڵبەستوون.

لە بەندی (١٤٣-١٤٤)ی (فروردین پشت)دا ناوی وڵاتی، توران، سلم و سایین و داهی هێنراوە کە بەپێی کتێبی (مزدیسنا پشتها) شوێنی وڵاتی سایین و داهی تا ئەمڕۆ بەشێوەیەکی بنجبڕ دیاری نەکراوە.

(بروس)ی مێژوونووسی کلدانی دەڵێت: کوروش لەگەڵ تیرەی داهیدا شەڕی کردووەو کوژراوە (دها، داهی) تیرەی سکایی بووەو دراوسێ (گرگان) بووە. (بڕوانە: تاریخ مشیر الدوله).

دوو شاری کۆن لە کوردستاندا هەن کە یەکێکیان (سایین قەڵا) و ئەویتریان (دهۆك)ە، ئەمانە یادگارو پاشماوەی (سایین و داهی)ن.

(ئارمن)ی مێژوونووسی یونانی سەدەی یەکەمی زاینی باسی ئەوە دەکات کە لە شەڕی داریوشی سێیەم و ئەسکەندەردا، سوارانی تیرەندازی (داهە) لە نێو لەشکرەکەی داریوشدا هەبوونەو بەشێك لە لەشکری ئەشکانیەکانیش لەم (داهانە) بوونە. بە گوتەی هیرودۆت ناوی یەکێك لە تیرەکانی پارس (داین) بووە. هەندێ لێکۆڵەر، ئەمانەیان بە سکایی زانیوە کە هۆزێکیان لە کەنارەکانی باشووری رۆژهەڵاتی دەریای خەزەر بوونەو (داهە)یان پێگوتراوە، هەندێ لە لێکۆڵەرەکان (سایین)یان بە مەملەکەتی چین و هەندێکی دی بە مەملەکەتی سەمەرقەند یان هەرێمی (بەڵخ) یان گوتووە. لێکۆڵەرەوەکان سەبارەت بە ئێرانیەکان، بایەخیان بە رۆژهەڵاتی ئێران داوەو ئەو شوێنانەی کە مەیدانی شەڕ بووە ئاوڕیان لێنەداوەتەوە!.

بۆ نموونە ئەفراسیاب کە بە پاشای تور ناسراوە، بە گوێرەی روونکردنەوەی ئاوێستا، مەیدانی چالاکیەکانی لە دەوروبەری دەریاچەی (چیچیست) – رەزاییە- بووە: لە کتێبی حەوتەمی (دینکرد) –زەردەشتنامە- بەندی ٣٩ دەڵێت: کەیخوسرەوی کوڕی سیاوەش دەسەڵاتو شکۆی کەوتە دەست. لە سایەی ئەو دەسەڵاتەوە ئەفراسیابی جادوی تورانی و یاوەرە بەد فەڕەکانی ئەفراسیابی شکاندو بتخانەکەی کەناری دەریاچەی چیچیست –ردزاییەی- وێران کرد کە بنکەیەکی ترسناکی درۆو دەلەسە بوو.

لە فەسڵی (٢٧)ی مینوخرد، بەندی (٥٩- ٦٣) دەڵێت: خێری کەیخوسرەو ئەمە بوو کە ئەفراسیابی کوشت و لە ڕەخی دەریاچەی چیچیستدا بتخانەکەی وێران کرد. لە (ادبیات مزدیسنا پشتها)دا نووسراوە: "کەیخوسرەو ماوەیەك پاش گەڕانەوەی لە ئازەرکشیسب" لەشکرێکی ئامادەکردو بە سەرکردایەتی (توس) ناردی بۆ توران تا تۆڵەی خوێنی (سیاوەش)ی بابی وەربگرێ، لە ئەنجامی کەڵەوەکێشی (توس)دا (فرود)ی برای کەیخوسرەو و (کوڕی سیاوەش و جریرە) هاتە کوشتن. ئێرانیەکان بە نائومێدی گەڕانەوە.

کەیخوسرەو جارێکی دی (توسی) ناردەوە شەڕی ئەفراسیاب و پاش چەند پێکادانێك، ئەنجام ئەفراسیاب هەڵدێ و هەوەڵجار لە ئەشکەوتێکی نزیکی (بردعە) خۆی دەشێرێتەوەو پاشان لەلایەن (هیومی زاهیدەوە) کە لە هەمان کێودا کونجی خەڵوەتی گرتبوو، ناسراو گیرا، لە ڕێگەدا لە دەستی دەرباز دەبێت و هەڵدێ. خۆی بە دەریای چیچیست –ڕەزاییە-دا دەکات کە پاشان دەری دەهێنن و دەیکوژن.

بەم پێیە ناوچەی سەڵتەنەت و دەسەڵاتداریەتی ئەفراسیابی ئاوێستا لە دەوروبەری نزیکی دەریاچەی چیچیست –ڕەزاییە- بووە نەك توران و ڕۆژهەلاتی دەریای خەزەر... لە سەردەمی (سلم نصر)دا، ئوفالکی ی سەرداری ئاشور، لە ساڵی (٨٢٩ پ.ز) لە نێوان خاکی مانناثی و پارشوادا لەگەڵ میرێکدا شەڕی کردووە کە ناوی (ئارتساری، ئارچاری) بووە.لەوەیە (ئیرەج)ی شانامە ئەم (ئارتساری، ئارچاری)یە بووبێ. (ئارتساری و ئارچاری) بە درێژایی ڕۆژگارو لە ئەنجامی دەماو دەم کرنا گۆڕاوەو بووە بە (ئیرەج). لە (فروردین پشت ئاوێستا)شدا ناوی ئەم پاشایە بە (ئاییری) تۆمار کراوە.

کتێبی ئاوێستا، لە فەسڵی بیست و سێدا، بوندەهشین دەڵێت: (سرم، تورەج و ئیرەج یان کوشت و رۆڵەکانی (هوبختگان)یان تەرتە و وەرتە کرد..هەرێمێکی گەورە لە باکووری جودی هەیە پێی دەڵێن: "بوختان- بوهتان" دوور نییە ئەم ناوە لە بناخەدا (هوبختگان) بووبێ و بە درێژایی زەمان گۆڕا بێ، بووبێ بە (بوختان، بوهتان)ی ئەمڕۆ. ئەم هەرێمە هەر درێژەی ناوچەی (ئارتساری)یە، ئەمەش ئەو بۆچوون و گۆشەنیگاو لێکۆڵینەوانەی سەرێڕا بتەوتر دەکات.

بە هەرحاڵ (سرم و تورەج)ی ئاوێستا هەرچییەك و هەر کێیەك بن، ئەوا (تور و سلم)ی ناو (خداینامك)ی پەهلەوی و شانامە بەپێی رووداوە مێژووییەکان و لێکچوونی ناوەکان دەبێ (ئاشورنازیربال و سلم نصر)ی پاشایانی ئاشور بن.

شانامە دەڵێت: "مەنوچەهر" هاتە دنیا، گەورە بوو، تۆڵەی بابی خۆی سەند. لە راستیدا گۆڕانکاری و کودەتا ناوخۆییەکانی ئاشور، کۆتایی بە سەڵتەنەتی (سلم نصر) هێناو دەوڵەتی ئارارات کە لە دەوروبەری واندا سەری هەڵدا بوو و گەشەی کرد بوو، (مینواش)ی پاشای ئارارات پەلاماری ئاشوریەکانی داو ناوچەی (بارشوا)ی لە چنگ ئاشورییەکان دەرهێناو لە ملەی کێلەشین بەردێکی تاشی و داچەقاند، هەر بەمەشەوە نەوەستاو خاکی ماننائی لە باشووری دەریاچەی رەزاییە داگیر کرد و لەوێندەریش کەتیبەیەکی (بەردەنووس) لە پاش خۆی بەجێ هێشت. لە (فروردین پشت)دا نێوی ئەم پاشایە بە (منوش چیر) هاتووەو وەك کوڕ یا نەوەیەکی ئاییری (ئیرەج) تۆمار کراوە. ناوی ماڵباتەکەشی لە ئاوێستادا بە (ئاییریاوە) هاتووە کە بە مانای یاریدەدەری ئێرانیانە. (چپ، چت، شت) بە مانای شا

بووە کە: (چپ، چە، شە) لەوەوە هاتووە. دەمێنێتەوە (منوش) کە لەگەڵ نێوی راستەقینەی ئەودا، واتە (منواس) یەکێکە. لەقەبی پاشایانی ماد (خشتریتە) بووە کە ئەمیش دەکاتە (چترا)ی ئاوێستا.

ئەو تیردیەی لەو دەڤەرەدا حوکمڕانی کردووە (نایری) ناو بووە. تەنانەت پاشایانی (ئارارات)یش بە خۆیان گوتووە: (نایری). رەنگە (ئایری) نێوی ماڵباتی (ئارتساری) بوو بێ کە لە بناخەدا (نایری) بووە. رەنگە (ئایریاوە)ش هەر لەوەوە هاتبێ.

هەر چەندە (ساردوریس) بەر لە (مینواش) پاشای ئارارات بووەو (سلمان نصری سێیەم) پاشای ئاشوری شکاندووە (٨٨٣- ٧٧٣ پ.ز) لێ چونکە ناوی (مینواش) لەگەڵ (منوش)ی ئاوێستادا تەواو وەکو یەکە، ئیدی (ساردوریس)ی کردووەتە ژێرەوەو دایپۆشیوە.

شانامە دەڵێت پاش (مەنەچەهر)، (نوزەر)ی کوڕی بوو بە پاشا. ئەفراسیابی پاشای توران هات و تەخت و تاجەکەی لێ ستاند. (نوزەر) و سەرانی فارسی دیل کردو حەپسی کردن. بە گوێرەی ناوچەی دەسەڵاتی حوکمڕانی ئەفراسیاب کە لە باسی (نور سلم)دا ئاماژەم بۆ کردووە، بۆی هەیە ئەم (ئەفراسیاب)ش (تیگلات پلیسری سێیەم) بێ، کە لە دەوروبەری (٧٤٨- ٧٢٨ پ. ز)دا دەوڵەتی تازەی ئاشوری دامەزراندو سنووری حوکمڕانی خۆی لە دەشتەکانی ئێرانەوە گەیاندە مدیترانە. لە ساڵی (٧٤٢ پ.ز)دا پەلاماری (ماد)ی دا شەست هەزارو پێنج سەد کەسی بە دیل گرت، ماڵاتێکی زۆری بۆ وڵاتی خۆی بە تاڵانی برد، دیلەکانی رەوانەی شام کردوون، یا رەنگە: (ئاشور بانیپاڵ)بێ کە لە کاتی راونانی (ئەهشری)دا چووەتە خاکی مادەکان و

یەکێك لە میرەکانی ماد بە نێوی (بیرس هنری) و دوو کوڕی ئەو میرەی بە دیل گرتووەو بردوونی بۆ نەینەوا.

سەرچاوە مێژووییەکان وا دەنوێنن کە پاش ئەو گەورە پیاوانی ئێران (زو- زاب) یان کردووە بە شا، کە پاش پێنج ساڵان مردووەو (گر شاسب)ی کوڕی هاتۆتە سەر تەخت.

لە سەردەمی (سارکن)ی دووەمدا، پاشای ماننائی ناوی (ئیرانزو) بووە، پاش (ئیرانزو، ٧١٦ پ.ز) پاشایەك هاتۆتە سەر تەخت، ناوی (ئازا) بووە. بەمجۆرە بێ (زو- زاب) یەك کەس نەبووە. بەڵکو دوو کەس بوونەو دوا بە دوای یەك هاتوونەتە سەر تەخت. (ئازا) بە دەستی دوو سەردار بە ناوانی (بغداتی ، میتاتی) کوژراوە.

دەبێ (زو)، (ئێران زو) بێ و (زاب)، (ئازا) بێ کە لە ئاوێستاشدا ناوی ئەم پاشایە بە (ئاو زەوە) تۆمار کراوە.

پاش کوژرانی (ئازا)، (سارکن)ی پاشای ئاشور (ئولوسوپو)ی برای (ئازا)ی لەسەر تەخت دانا. دەبێ ئەمەش بە (گرشاسب) بزانین.

مفاتیح العلوم: (گرشاسب) بە برازای (زاب) قەید دەکات. پاش ئەمە نێوی (دیاکو- کیقباد) دێتە ئاراوە.

سەرچاوە مێژووییەکان وا دەنووسن کە گرشاسب، پاش نۆ ساڵ مردووە. ئەفراسیاب دووبارە پەلاماری ئێرانی داوە. ئێرانی گرتووەو (پێشدادیەکانی) لە بەین بردووە. ئەم ئەفراسیابەش هەمان (سارکن)ی دووەمی پاشای ئاشورە کە لە ساڵی ٧١٥ پ.ز لەشکری کردووەتە سەر ماننائی و (دیائاکو) یا (دیاکو)ی سەرۆکی گرتوون و رەهەندەی حومسی (حمص) شامی کردووە.

(ئولوسونو)ی پاشای ماننائی، دەستنیژی ئاشور بووە. پاش مردنی ئەو ئیدی میللەت کەوتووەتە سەرپێچی لە ئاشور، و بە سەرکردایەتی (دیا ئاکو) کەوتووەتە دژایەتی و بەر بەرەکانی ئاشور، چونکە یەکێتیی و تەبایی تەواو لە نێو تیرەکانی زاگرۆسدا نەبوو، بۆیە نەیدەتوانی بەرگەی دەوڵەتی کۆکوك و بەزاکونی ئاشور بگرێ و دیاکۆ بە تاقی تەنێ دژی وەستاو دیل بوو.

بە ڕیوایەتێکی دی: دیاکو سەرداری (ماندا) بوو. (دیوسیس)ی کوڕی کردبوو بە پاشای ئارارات. (دیوسیس) بە قۆشەنی ئاراراتەوە خۆی بەخاکی ماننائی دا دەکات، (سارکن) دێتە مەیدان و دیوسیس) یەخسیر دەکات.

بابلیەکان بە گشت هۆزەکانی باکوور، تا دەریای ڕەشیان دەگوت (ئوممان ماندا)، مستر هول دەڵێت: وشەی (ماندا) نێوی هاوبەشی (مادو سیت) بووە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکە کە ئەو تیرانە بە گشتی هاونەژاد بوونەو بەیەك ناو دەناسران و هیچ جیاوازییەکی زمانی و نەژادی لە نێوان دەوڵەتانی: ئارارات، ماننائی و ماد نەبووە.

مێژوونووسانی یونان دەڵێن (کی ئەفسار) پاش یەکگرتنی ماد- بابل، شۆڕەت و لەقەبی شای (ئوممان- ماندا)ی هەڵگرت. (نبوئید)ی پاشای بابل لە کەتیبەیەکدا کە دەربارەی هەرەسی نەینەوا نووسیویەتی، پاشای مادی وەکو پاشای (ئوممان و ماندا)کان ناساندووە.

شانامە دەڵێت: کەیقوباد لە چیای ئەلبورزا گۆشەگیر بووە، ڕۆستەم چووە هێناویەتی، و زاڵ بە کۆی دەنگی میللەت ئەوی لەسەر تەخت داناوە.

(کەیقوباد) بەگوتەی هەموو توێژەرەکان (دیاکۆ)یە، کە هەڵاتووەو هاتووەتە ناو تیرە مادەکانی سوریاو- دەبێ مەبەست لە میتانیەکان بێ-

ئیدی میللەت بە کۆی دەنگ کردوویانە بە پاشای خۆیان. تیگلات پلیسری سێیەم، پاشای ئاشور باسی ئەو مادانەی لەو ناوچانەدا کردووە.

نێوی ئەم پاشایە لە ئاوێستادا (کوات)ـە کە بووە بە قوباد. وشەی (کوات) گۆڕانی بەسەر هاتووەو بووە بە (دیکو). واتە (دیاکو، دیکو) ئەگەر بە بەرەواژی بخوێنرێتەوە دەبێ بە (کوید، کوات، قباد).

(کی=کەی) لە زمانی پەهلەویدا مانای گەورە، بە دەسەڵات بووە. کوردان ئەمڕۆش بۆ خەڵکی گەورە وشەی (کا، کاك) دەخەنە پاڵ ناوەکەی وەك: (کابرا، کاك ئەحمەدی کاعەلی).

کەیقوباد، بە نەوەی (نەوزەر)ی کوڕی مەنوچەهر دەزانرێ. چونکە (دیوسیس) پاشای ئارارات بوو، بە قۆشەنی ئارارات پەلاماری باشووری دابوو، بە نەوەی (منواش) پاشای ئارارات ناسراوە. خۆ لەوەشە هەر بە راستی سەر بەیەك بنەماڵە بووبن. چونکە چ جیاوازیەك لە نێوان ئارارات و ماننائی نەبووە، پاشای ئارارات لە گەورە سەرانی ماننائی بووە؟

هیرودوت دەڵێت: دێهاتیەك، (دیکوس، دیجوس) سەرپەرشتی بەرژەوەندی گشتی دەکرد، کە زانیویەتی دەرەقەتی کارەکەی خۆی نایەت، دەستی لەو کارە هەڵگرتووە، ئیدی دزی و چەتەیی و رێگری پەرەی سەندووە. خەڵکی ماد کۆبوونەتەوەو گشت لە گشت (کەیقوباد) یان کردووە بە پاشا (٧٠٥ پ.ز).

هەندەك لە دانایان دەڵێن (دیاکو) وشەیەکی ئازیائیکیە، لە کاتێکا کە : (دیك، دیاکو، دیجو) لە زمانی پەهلەویدا مانای سەرۆك، گەورە، خودان دەسەڵاتە. ئەڵمانەکانیش خۆیان بە (دویچ، دوچ) دەزانن، کە رەنگە هەر بە

هەمان ماناو مەبەست بووبێ. دوور نیە (دیاکو) وشەیەکی گۆتی بێ، کە گوتیەکان کۆنترین دانیشتووانی زاگرۆسن.

(سلم نصر)ی پاشای ئاشور لە بەردەنووسێکی (کەتیبە) خۆیدا بۆ یەکەمجار لە ساڵی (٨٣٧ پ.ز) ناوانی (ئامادای و پارشوا)ی تۆمار کردووە.. وشەی (ماد) لە زوبانی هەر میللەتێکدا بە جۆرێ تەلەفوز کراوە وەك: (مد، میدیا، مید، ئامادای).

(پروس)ی مێژوونووسی کلدانی دەڵێت: میللەتی ماد لە زەمانی زۆر کۆندا (بابل)یان داگیر کردووە، دووسەدو بیست و چوار ساڵ لەوێندەر حوکمڕانیان کردووە. هەر هەمان مێژوونووس و پێشەوای نێوداری کلدانیە کە زەردەشت بە سەری زنجیرەی (ماد نەژادەکان) دەزانێ کە لە ساڵانی (٣٠٠٠- ٢٢٠٠ پ.ز) لە کلدەدا حوکمڕانیان کردووە. ئەم مێژوونووسە چونکە خۆی کلدانی بووەو لە سەردەمی هەخامەنشیەکان ژیاوە، بێگومان مادەکانی لە نزیکەوە و باش ناسیوە.

(مادیسون- غراینت)ی ڕۆژهەڵاتناس، مادەکانی بە دانیشتوانی کۆن و ڕەسەنی زاگرۆس داناوەو دەڵێت (شەش هەزار ساڵ پ.ز) لە مادستان بوونە.

(میرزا عەباس خان ئیقبال) لە مێژووەکەی خۆیدا دەڵێت: (مادای، لە سەردەمی حەمورابی دا، لە میزوپۆتامیا ناسرا بوون، لەو ڕۆژگارەدا کلدانیەکان ئەسپی ڕەسەن و چاکیان لە میللەتی ماد وەردەگرت و بۆ وڵاتی خۆیان دەبرد.

(دمرکان)ی مێژوونووسیش دەڵێت: تایفەی ماد لە ساڵی دوو هەزاری پێش زاین، لە قەفقازەوە هاتوون، چونکە دەوڵەتی بەهێزی

(ئارارات)یان له رێدا بوو، و بەو دەوڵەتەیان نەدەوێرا، بۆیە لە رۆژهەڵاتـەوە تێپەڕ بوون.

مێژوو، گۆتیەکانی بە کۆنترین تایفـەی ناوچـەکانی زاگـرۆس دانـاوە کە لـە کۆنـا لـە بـاکووری عیلامـەوە تـا ئاتنـە، ناوچـەیەکی فراوانیـان داگیر کـردووەو تەنانـەت سـەردەمێك سۆمەریـشیان داگیر کـردووە، لەسـەرەتاکانی سەدەی بیست و شەشەمی پێش زاینـدا، ئەکەد، سۆمەر، عیلامیـشیان داگیر کردووەو سەدو بیست و پێنج ساڵ لـە بابـل دا حوکمیـان ڕانیـوە.بـە گوتـەی (دمرکـان) کوسی، کاسـیتەکانیش، لـە سـاڵی دوو هـەزاری پـێش زاینـدا لـە قـەفقازەوە هـاتوون، بـەم پێیـە و بـە گـوێرەی قـسەی ئـەو توێـژەرو مێژوونووسانەی سەرێ، مادەکان وەچەو نەوەی گوتی و کۆسیەکانن، کە ڕای نووسەریش لەسەر ئەوەیە کە ئەو تیرانە هاو نەژاد بوونە... بەپێی تـەورات (مادەکان) لە نەوەی یافپ و وەچەی مادائی بوونـە.. قاموسی کتـێبی پـیرۆز، وەرگێـڕان و دانـانی (مـستر هـاکس)ی ئـەمریکی: نەخـشەی شـوێنی ئـاکنجی بوونی نەتەوەکانی پاش تۆفانی تێدایە. لەو نەخشەیەدا لە کەناری باکووری دەریـای سـووردا ناوچـەیەك بـە نێـوی (مـدیان) نیـشان دەدا کـە کەوتووەتـە نزیکی رۆژهەڵاتی کەنداوی عەقەبە. لەوێدا (المدیانین) نووسراوەو بە (بەنی حام) دانراون. عیلام، ئاشـور، عـەرەبی بـەنی سام، شـنغار (شـنغار: لـە بـەرە بەیانی مێژووەوە تا ئەمڕۆ هەر شـوێنی کـوردێن ئێـزدی بـووە) لـە ناوچـەی بابل و کوشدا دوو جار نیشانداوە. جارێکیـان لـە بـاکووری عـیلام و جـارەکی دی لـە رۆژئـاوای دەریـای خـەزەر و ئەوانیـشی بـە بـەنی حـام نووسـیوە. لـە تێکستی کتێبەکەشدا (مـدیان) بـە کـوڕی ئیـبراهیم وقتـورەی ژنـی ئیـبراهیم

زانیـوە (پیـدایش: ٢٥: ٢و ٤) و دەڵێـت ئیـسماعیلیان لـە دانیـشتوانی مـدیان بوونە.

لـەو کەتیبانـەدا کـە لـە سـەردەمی (تـیگلات پلیـسری سـێیەم)ـەوە ماونەتەوە، نـاوی ویلایـەتی پارشوا و شـاری زاگروتیـی مـادە بـە هێزەکـان و سەر زەمینی نیشائی دەبینین.. لە ساڵانی (٨٤٦- ٧٢٨ پ.ز) پاشـایەکی دیکـەی (ئاشور)یش بە نێوی (شمش ئاداد) ناوی مادی هێناوە (٨٢٤- ٨١٣ پ.ز) لێرەدا زاگروتیەکان، بە مادە بـە تواناکـان دادەنـێ. ئـەو سـەردارە میتانیـەی کـە لـە کودەتایەکی ناوخۆدا (ئازا)ی پاشای ماننائی کوشتبوو، خەڵکی زاگروتی بوو. زاگروتییەکان و ماننایيەکان یەك میللەت بوونە. زۆر نـزیکـەی زاگرۆتیـەکان کـۆنترین هـۆزی زاگـرۆس بـووبن، و زاگرۆسـی و زاگروتـی دوو نـاون کـە سەرچاوەکەیان یەکـە. هەنـدێ لـە مێژوونووسـان ئـەم هۆزەیـان بەسـاکارتی داناوەو بەو (کورتی)یانەیان زانیون کە لـە دەوروبـەری هـەولێر و کـەرکووك نیشتەجێ بوونە.

لە سەرێڕا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە لـە ناوەنـدی هـەزارەی دووەمـی پێش زایندا، دەوڵەتی (میتـان) لـە (میـد) دەچێت لـە ناوچـەکانی سـەرووی دیجلەو فوراتدا —لە باکووری جزیرە- سەری هەڵداوە، لە جوملەی سـوبارو - گوتی- و کۆسیەکان دانرا بوو.

مێژووەکـەی (مـشیر الدولـه) ددڵێـت: (لـە سـەدەی هەشـتەمی پـێش زایندا، (میداس) ناوێك لە (لیدیه) حوکمڕانی دەکردو ئەو پیاوە لە مێژوودا بە (میتـای، موشـکی)ش نێـو بـراوە. ئـەم پاشـایە لـە دەوروبـەری (٧٧٠ پ.ز) لەگەڵ سەران و پاشای ئارارات بووە بە یەك و دژی (سارکن)ی دووەم، پاشای ئاشور، شەڕیان کردووە. سنوورو گەوشەنی (لیدیە) لە رۆژهەڵاتـەوە دەریـای

ڕەش –مەرمەڕە- دەریای سپی بووە، گەیی بووە قزیل ئیرمق، هەندێ کەس باوەڕیان وایە کە وڵاتی (ئورات رو یا وان) لەم لەشکرکێشیەدا بەشێك بووە لە ماد.

لێرەدا زێدەباری ئەوەی کە یەکێتیی و یەکبوونی موشکی و میتانیان ئاشکرا دەبێت، ئەوەش دەکەوێتە روو کە ئەم میللەتە دەسەڵاتی بەسەر مەملەکەتەکانی (لیدیە)دا هەبووە، دۆستایەتی ئارارات و میتانیان، هەروەها ئارارات و مادیش نیشاندەدات.. هەر چەندە نووسراوە لەم لەشکرکێشیەدا دەوڵەتی وان بەشێك بووە لە ماد، بەڵام لەو مێژووەدا دەوڵەتی ماد هێشتا ئەو تواناو دەسەڵاتەی پەیدا نەکردبوو، بۆیە ماننایيەکان بوونە، کە پاشایەکانیان لەگەڵ پاشایانی ئاراراتدا لە یەك تیرەو بنەماڵە بوونە.

(تیگلات پلیسری سێیەم) کە باسی عەشایەری مادی لە باکووری سوریا کردبوو، ئەوانە لەو تیرەو هۆزە میتانیانە بوونە کە (تیگلات پلیسر)ی پاشای ئاشور بەمادی داناون. ئەمەش وا دەگەیەنێ کە جیاوازیەك لە نێوان (مید) و (میتان) نەبووەو لەوەشە وشەی (ماد) و (مید)ش هەر لە میتانەوە هاتبێ.

(ئاسەر هەدون)ی پاشای ئاشور لە کەتیبەیەکی خۆیدا (فرائورتیس)ی کە شۆرەتەکەی (خشتریتە) بووە، بە (کشتاریتی) ناو بردووەو وای نیشان داوە کە سەرۆکی شاری کارکاشی بووە. بەڵام زانایان، شاری (کارکاشی)یان بە وڵاتی کوسییەکان، لە مەرکەزی زاگروس زانیوە (بڕوانە کتێبی: کردو پیوستگی نژادی و تاریخی او، رشید یاسمی)، هەر لەو بەردەنووسەدا ئەوە دەکەوێتە بەرچاو کە (کشتاریتی) بە پەیڕەوە مادەکانی خۆی لەشکری

کردووەتە سەر شارەکانی ئاشور. چونکە سەرۆکی شاری (کارکاشی) بووەو پەیڕەوەکانی دیارە کوسیەکان بوونە کە بە (ماد) ناوبراونو زانراون.
هەر هەموو ئەم بەڵگانە ئەوە نیشان دەدەن کە مادەکان و کوسییەکان، کوسییەکان و گوتیەکان هەموو یەك میللەت بوونە کە پاشان هەر هەموویان ناوی کوردیان لەخۆ گرتووە.
مادەکان بەسەر دوو ناوچەدا دابەش بوو بوون:

١- مادەی بچووك، کە ئازەربایجانی ئێستا بووە، سترابون لە کتێبی (١١) فەسڵی (١٣)دا دەڵێت: مادی ئاتروپاتی تا سەردەمی هێرشی مەقدونیا بەشێك بووە لە مادی گەورە. (ساتراپ ئاتروپاتس) نەیهێشت ئەم ناوچەیە بکەوێتە دەستی مەقدونیاکان. لە پاداشتی ئەم کارەیدا، لە قەبی پاشایەتی وەرگرت.. بەم بۆنەیەوە بە ناوچەی دەسەڵات و حوکمڕانیەکەیان گوتووە (ئاتورپاتکان) و ئەم وشەیە بە تێپەڕ بوونی رۆژگار بووە بە (ئازەربایجان).

٢- مادی گەورە، بریتی بووە لە ناوچە کوردنشینەکانی ئەمڕۆ، وەك: ئەراك، ئەسفەهان، ڕەی، خۆراسان، مازندەران، خوزستان و لوڕستان.

هیرودوت بەمجۆرەی خوارەوە ناوی شەش تیرەی مادی تۆمار کردووە:

١- بۆزەکان ______ Lesboses
٢- پارتاکنەکان ______ Les partacenes
٣- ستروخانەکان ______ Stru chats .
٤- ئاریزانتەکان ______ Les arizantes
٥- بودینەکان ______ Les bodliens
٦- ماژەکان ______ Les mages

بەپێی هەندێ مێژووی کۆن، ناوچەی ئەو تیرانە بەمجۆرەی خوارەوەیە:

١- بوزەکان ــــــــــــــ عێراق.

٢- پارتاکنەکان ــــــــــــــ شاری ڕەی و ڕەخێن دەریای خەزەر.

٣- ستروخاتەکان ــــــــــــــ مەرو، خەوارزم

٤- ئاریزانتەکان ــــــــــــــ ئازەربایجان، ئاوەرۆی ڕوباری ئاراس.

٥- بودینەکان ــــــــــــــ چوونەتە هیندستان.

٦- ماژەکان ــــــــــــــ ئەمانە مغ و (ماگوش)یان پێدەگوترا، لە کوردستانی ئێستادا نیشتەجێ بوونە.

هیرودوت، لە باسی لەشکرکێشی داریوشدا بۆ سەر سکایەکان، ئاماژە بۆ تایفەی بودینەکان، کە لە ناو سکایەکانا بوونە، دەکات. لەلایەکی ترەوە بودینەکان چوونە بۆ هیند. لە باسی گۆتیەکاندا نووسراوە کە ناوی مالْباتی (بودا)، (گوتم) بووە. بەردەنووسێکی (ئاسوکا)ی پاشای هیند کە لە سالانی (٣٦٠- ٢٢٣ پ.ز) حوکمڕانی کردووە، دۆزراوەتەوە، ئەوە نیشان دەدات کە (بودا) لە ساڵی (٤٨٠ پ.ز) مردووە. بەم پێیە دوور نییە حەزرەتی بودا کە پاش دەسەڵات و حوکمڕانی مادەکان بووە بە پێغەمبەر، لە بودینەکانی ماد بووبێ، کە چوونە بۆ هیند، مادەکانیشمان بە کوسی زانیوە. لەوەیە بودینەکان بووبن بە چەند بەشێکەوە، بەشێکیان چووبن بۆ هیندو بەشێکی تریان لەگەڵ سکایەکاندا چووبن بۆ تراکیە. بۆ نموونە (دروپیکەکان) کە لە قەومی سکائی بوونە، لە نزیکی دەریاچەی ئورال دەژیان، هیرودوت بە

تیرەیەکی چادرنشینی فارسی داناون. دیارە ئەم تیرەیە دوو بەش بوونە، دانیەکانیش بەو جۆرە بوونە!

(کتزیاس)ی مێژوونووسی یۆنانی کە ماوەیەك لە دەرباری ئەردەشێری دووەمی هەخامەنشیدا پزیشك بووە، بەم جۆرەی خوارەوە ناوی پاشایانی مادی تۆمار کردووە:

ئاریاکیس : بیست و هەشت ساڵ حوکمڕانی کردووە.

مانداکس : پەنجا ساڵ = =

سوسارمس: سی = = =

ئاریتاس : پەنجا = = =

ئاربیانس : بیست و دوو ساڵ = =

ئارسەیوس: چل ساڵ = =

ئارتەنیس : بیست و دوو ساڵ = =

ئارتی پارنس: چواردە ساڵ = =

ئاستی براس: چل = = =

ئەسپنداس : سی و پێنج ساڵ = =

ئاستیاکس: سی و پێنج ساڵ = =

کتزیاس دەڵێت، دوا پاشای ماد نێوی (ئەسپرس) و لەقەبەکەی (ئەستیاکس) بووە، بەڵام بە قسەی هیرودوت ژمارەی پاشایانی ماد چوار بووەو ناوەکانیان بەمجۆرەی خوارەوەیە:

دیوکیس : پەنجا ساڵ حوکمڕانی کردووە، ناوی راستی (دیاکو)یە.

فرایورتیس : بیست و دوو ساڵ حوکمی کردووە، ناوی راستی (فرورتیش)ە.

سیاکزار : چل ساڵ حوکمڕانی کردووە، ناوی ڕاستی (هوختشرە)یە.
ئاستیاز : سی و سێ ساڵ حوکمڕانی کردووە.
جیاوازی ژمارەی پاشایان لەلای هیرودوت و کتزیاس لەوەوە هاتووە کە کتزیاس سەرانی بە توانای هەندێ هۆزی مادو هەروەها پاشایانی ماننائی و ئاراراتیەکانیشی بەپاشای مادستان لە قەڵەم داون. بۆ نموونە (سارکن)ی دووەم لە لیستی باجدەرانی خۆیدا ناوی (ئاریاك، ئارتیك و مانداك) تۆمار دەکات، کە ئەمانە دەبێ هەمان ناوبن کە کتزیاس تۆماری کردوون: (ئاریاکیس، ئارتیاس و مانداکس) کە هەریەکەیان لە هەمان کاتدا لە ناوچەی خۆیدا حوکمڕانی کردووە.
هیرودوت دەڵێت: مادەکان لە کۆندا هەموویان (ئاریان) پێگوتراوە، بەڵام کە هاتنە (ئەتینا) لای ئاریانەکان، ئەم ناوە گۆڕا و بوو بە ماد. (بڕوانە کتێبی: ماد، بە زمانی فەڕەنسی).

★ ★ ★

لێرەدا ئەو پرسیارە بەرۆکان دەگرێت، کە میللەتێك خودانی ئەم هەموو شکۆیە بێ چۆن لە پڕا لەلاپەڕەی مێژوو ون بووە، و بەو جۆرە ناوی بە فەرامۆشی سپێردراوە، کە لە شانامەشدا ناوێکی نەبراوە. ئەمڕۆ تاقە عێڵێك نیە کە پێی بگوترێ ماد. لە کاتێکا میللەتانی دراوسێی ماد (ئاشوری، کلدانی، ئەرمەنی، فارس) کەم تا زۆر هەن و هەر بەناوی یەکەمجاری خۆوە ناو دەبرێن. خۆ (ئاشوری، کلدانی) بەر لە مادەکانیش لە مەیدانی سیاسەت دەرچوو بوون... تۆ بڵێی لە سەرانسەری مادا، بە تایبەتی لە مەڵبەندی مادستان میللەتی کورد پەیدا بووبێ و نێوی مادی لە خۆیدا تواندبێتەوە،

بێ ئەوەی بە مادستان بگوترێ کوردستان. وڵاتی ماد پاش ون بوونی وشەی ماد، لە سەردەمی ساسانییەکاندا (مای) پێگوتراوەو پاش ئیسلام (ماه)ی پێگوتراوەو پاشان بووە بە کوردستان.

لەسەرێڕا ئەوە روونکراوەتەوە کە یەکەمجار وشەی (کاردا) لە دەوروبەری جودی دۆرزراوەتەوەو بە نەژادی (گوتی، جوتی، Guti) دانراوە.. لە ساڵانی (١٠٩٨- ١٠٧٨)دا (تیگلات پلیسری ئاشور) ناوی تایفەی کورتییەی لە چیاکانی (ئازو- حازو کە دەکاتە ساسون‌ی ئەمڕۆکە) بردووە. قەراڵ (توکولتی ئینورتا)ش وشەی (گوتی) بە (کورتی) داناوە.

(کاردوکان) لەگەڵ گەزنەفوندا شەڕیان کردووەو لە شەڕی ئەسکەندەر- داریوشدا بەشداریان کردووە. بە گشتی شوێنەکانیان، ناوچەی سەرووی دیجلەو فورات بووە کە دەوڵەتانی: (نایری، موشکی، خالدی، میتانی، هانی، کالیات)یان دامەزراندووە.

ئەنجام مێژوونووسانی یونانی وشەی (کورتی)یان لە ناوچە جۆراو جۆرەکانی ئێراندا نێو بردووەو لە (فارس، ناوچەی مادی گەورە، ئازەربایجان، کەنارەکانی باشووری دەریای خەزەر، ئەرمەنستان) نیشان داوە. سترابوون دەڵێت: کورتی، مەرد، ئەمردەکانی پارس، و ئەو تیرانەی کە لە ئەرمەنستاندا نیشتەجێن و تا ئەمڕۆش هەمان ناویان پاراستووە، هەموو لەگەڵ چیاییانی ئاتروباتیدا لە یەك نەژاد بوونە. هەروەها ناوبراو، شوێنی کورتیەکان بە بەشێك لە وڵاتی پان و بەرینی ماد دەزانێ. لە شوێنێکی دیدا دەڵێت: ناوچەی باشووری ئاتروباتی کۆسارێکی سەخت و ساردە. جگە لە هۆزو تیرەی چیایی چ کەسێکی دی لەو ناوچانەدا نیە (کادوسیەکان، ئەمردەکان، تابورەکان و کورتیەکان) هەر هەموویان سەرگەرمی ڕێگرین، و

تێکەڵەیەکن لە خەڵکی ناوچەکەو موهاجیرانێك کە بە ئارەزووی خۆیان هاتوونەتە ئێرە. ئەو تیرەو هۆزانەی لە هەموو کۆجارەکانی زاگرۆس و نیفاتسدا بڵاوبوونەتەوە (بە باکووری جزیرەیان دەگوت نیفاتس).

ماموستا رەشید یاسمی پێی وایە گومان لەوە نییە کە هەم لە باری شوێن و هەم لە باری زەمان و رووداوە مێژووییەکانەوە، (کورد) بەشێك بووە لە مادو هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو نیە کە مادو کورد لێکدی جیا بکاتەوە.

مێژووی کۆنی ئێران دەڵێت: (ماد) تیرەی (کوردە)و (دیلەمیەکانیش) لەوانن. (سایس)ی پروفیسور لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا دەڵێت: (ماد) عەشایەرو تیرەو تایفەی کورد بوونەو نیشتمانەکەیان لە باکووری سوریاوە تا دەریای خەزەر درێژەی هەبووە.. لە سەردەمی هەخامەنشینەکانا ئەم میللەتە هێشتا هەر (ماد)ی پێدەگوترا.. پاش ئەسکەندەر، هەندێ جار لە بری مادەکان، باسی ژیان و چالاکی (کورتیەکان) لە مادستان کراوە.

لە بەرگی دووەمی کتێبی: (مزدیسنا پشتها)دا هاتووە: "وشەی ماد لە کتێبی پەهلەوی ئەردەشیر بابکاندا بە هەمان شێوەی کۆنی هەخامەنشی واتە (مادیك)، ماد هاتووە، لە کتێبی نێو براودا چەندین جار ناوی پاشایەکی (کورد) مادیك هێنراوە، کە رەقیب و خەنیمی ئەردەشێر بابکان بووە. هەوەڵجار ئەردەشیر شکاوەو هەڵاتووە، بەڵام دوای ماوەیەك لەشکرێکی چوار هەزار کەسی سازداوەو پەلاماری کوردەکانی داوە. هەزار کەسی لە کوردەکان کوشتوە و کۆمەڵێکی لێ برینداز کردوون و بەدیلی گرتوونی. هەروەها پاشای کوردو کوڕانو برایان و کەسوکاری ئەو پاشایەی لەگەڵ تاڵانیەکی زۆردا بۆ پارس ناردووە.

(مادیك)ی پەهلەوی لە زوبانی عەرەبیدا بووە بە (ماهی). لە کتێبی جوگرافیازانانی ئێران و عەرەبی سەدەکانی ناوەڕاست دا زۆرجار ناوی (ماه) دەبینین. بەڵام لەو کتێبانەدا ناوی (ماهە) پتر بە هەندێ ناوچەی ڕۆژاوای ئێران گوتراوە، ویس کیژی ڤارون پاشاو شابانۆی شار بوو کە خوشکی ویرو ژنی شاموبد و ماشوقەی رامینی برای شاموبدی خەڵکی وڵاتی (ماه) بوو کە ڤارون شای ئەوێ بووە.

کە ئەردەشێر بابك بە پاشای کوردی گوتووە، (مادیك) ئیدی ئەمە گومانڕەوێنێکی تەواوە کە مادو کورد یەك بوونە. لەومیە (ماد) ناوی بنەماڵەو ماڵباتی شاهانی وەك هەخامەنشی، ساسان و ئەشکان بوو بێ. وشەی (کورتی، کورد)ش ناوی ڕەگەزی ئەسڵی گەورەترین بەشی میللەت بووبێ.

ڤیکتۆر لانکوا، کە نووسینی مێژوونووسانی ئەرمەنی کۆکردووەتەوە دەڵێت: بەزمانی ئەرمەنی، بە (مادی) دەڵێن مارو نەوەی ئەژدەهاك. دوا پاشای (ماد) بە زمانی ئەرمەنی (ویشتا بازونك)ی واتە ئەژدیها زادەی پێگوتراوە!. مارەکانی ئەرمەنستان هەر هەمان تایفەی مەرد، ئەمردەکانی سترا بونە. کەسترابون لە هەموو شوێنێکدا لەگەڵ کورتیەکاندا ناوی هێناون و بەیەك نەژادی داناون. چونکە مادەکانیش لەگەڵ ئەو تایفانەدا هاونەژادو هاوزمان بوونە، بۆیە بە مارەکانیش گوتراوە ماد، وا دیارە مادەکان لەو تیرانە پێکهاتوون.

پاش توکولتی- ئینورتای پاشای ئاشور، یولیپ-ی مێژوونووسی یونانیش، دوو سەد ساڵێك پ.ز ناوی (کورتی) هێناوە، یولیپ لە کتێبەکەی خۆیدا دەڵێت: (ساتراپ ماد مولون) کە لە ئانتیوکوس-ی پاشا هەڵگەڕایەوە، هەم ویلایەتی

بابلی داگیرکردو سەربەخۆیی خۆی راگەیاندو هەم سەردارانی ئانتیوکوسی تێك شکاندبوو. وەختێ دەبیستێ پاشا گەییوەتە کەناری فورات، لە ترسی ئەوەی نەبادا رێی (ماد)ی لێبگرن، پردێکی لەسەر دیجلە هەڵبەست.

مولون باوەڕو متمانەی بە خەڵکی بابل و خوز، کە تازە هێنابوونیە ژێر رکێفی خۆی، نەبوو. تەنێ متمانەی بە میللەتی (کورتی) بوو کە بەردەقانی هاوێژی کارامە و لێهاتووبوون.

گەزنەفۆنیش کوردەکانی بە قۆچەقانی هاوێژی کارامە ناو بردووە. میللەتانی (بابل، ماد، خوزستانی) لە سایەی دەسەڵاتی مولوندا بوونە. بە گوتەی پولین: مولون، لە خەڵکی بابل و خوزستان دڵنیا نەبووە، متمانەی تەنیا بە میللەتی (کورتی) هەبووە. لێرەدا پولیپ لە جێی (ماد). (کورتی و کورتیان)ی نەك بە یەك تایفە بەڵکو بە یەك نەتەوەی زانیون. وا دەردەکەوێ کە وشەی (ماد) پاش خۆرگیرانی سەڵتەنەتی مادەکان، بووە بە ناوی جوگرافیایی شوێن، و بەدرێژیی رۆژگار بووە بە (مای، ماه). بەمەشەوە پێویستە پتر لە لایەن و کەلێنەکانی ئەم مەسەلە بکوڵرێتەوە.

لەو ناوچانەدا کە ناوی، کاردو و کورتیەمان بردووە، سەرەتا گوتیەکان پاش تیرەکانی گوتی سوباری، موشکی، نایری، میتان و خالدیەکان، دەسەڵاتیان پەیدا کردووەو هەموو کوردستانی باکوریان خستۆتە ژێر رکێفی خۆیان. دەوڵەتانی (میتان و ماد) لەلایەن تایفە کوسیەکانەوە دامەزراون. کەتیبەیەکی سەردەمی حکومەتی (لوگال ئاندرە موندو) کە دەگەرێتەوە بۆ هەزار ساڵ پ.ز، دۆزراوەتەوە و بە سوباری گوتووە سوبیر، ئاشوریەکانیش پێیان گوتووە (سوبارو) و سنورەکەی لە باکوری عیلامەوە تا شاخی ئامانوس،، کە کەوتووەتە ئاتنەوە درێژەی هەبووە. میللەتی گوتی چەندین

سەدە لەم ناوچەیەدا حوکمڕانیان کردووە، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێ لێکۆڵەر، وشەی (سوباری) بەناوی جوگرافیایی ئەو ناوچەیە دەزانن کە دانیشتوانەکەی (گوتی) بوونە.

پرۆفیسۆر (سپایزەر) لە کتێبی میللەتانی میزوپوتامیادا بە بەڵگەوە سەلماندویەتی کە (کورد) لە نەژادی گوتین. خاکی دەوڵەتی میتان، دەڤەری باکوری دیجلە و فوڕات بووە. کە میتانیەکان بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان و پاش داڕوخانی دەوڵەتەکەشیان لەگەڵ تیرەی کاردو-کورتیەو هاو نەژادەکانیاندا لەوێ نیشتەجێ بوونە.

گەرچی هیرودوت، سیرتیەکانی- کەکورتی-ن- بە یەکێك لە تیرەکانی فارس ژماردووە، بەڵام شوێنی نیشتەجێی ئەم کورتیانە ڕۆژهەڵاتی ئێران و زۆر لە پارسەکان دوور بووە، وبگرە لە نێو کەوشەنی سەڵتەنەت و دەسەڵاتدارێتی مادەکاندا بووە. ڕاستە کە بەشێك لە کورتیەکان لە فارسدا بوون. بەڵام خۆ لە ئەرمەنستان و مازندەران و ئازەربایجانیشدا زۆر بوونەو مەڵبەندی ئەسڵیان مادستان بووە.

(سترابون) لە کتێبی (١١)، فەسڵی (١٣) دا دەڵێت پارس، بەشی هەرە زۆری لە کەنارێن دەریای ئەریترە (کەنداوی فارس) بووە و تا ئەو کاتەی دەسەڵاتی مادی لە ناو نەبردبوو، پەلی بۆ شوێنانی دی نەهاویشتبوو.

هیرودوت، (دروپیکەکان)یشی بە تیرەیەکی پارس داناون کە لە سکایەکان بوون و شوێنی نیشتەجێ بوونیان، دەوروبە ری دەریاچەی ئورال بووە. هەروەها (داینەکان)یشی بە تایفەیەکی پارس زانیوە، ئەمانیش لە سکاکان بوونەو شوێنیان باشوری دەریای خەزەر بووە. ( بودین)ی بە (ماد) زانیوە و ناوی ئەم تایفەیە لە سەردەمی لە شکرکێشی داریوش بۆ سەر تراکیە لە نێو

سکاکاندا دەبینین، ئایا دەشێت، گوتی، کوسی، ماد، میتان کە ئەژدادی کوردەکانن، لەگەڵ تایفەی پارسدا لە بنەڕەتا لە سکاکان بووبن. لە رۆژگاری کۆندا سنووری سکاکان بە رۆژهەڵاتی تورکستان و مەغولستان و باشووری ئەفغانستان، ئێرانی ئێستا، رۆژاوای دەریای مازندەران نیشاندراوە. لە راستیدا گەییوەتە شاخەکانی توروس. ئێرانی ئێستا جگە لە -خوزستان- لە ژێر دەسەڵاتی ئەم میللەتەدا، واتە سکادا بووەو هەر تیرەیەکی بەنێوی خۆیەوە حوکمڕانی کردووە.

مێژووی ئێرانی کۆن نووسیویەتی: "بەپێی هەواڵێك لە مێژوونووسانی یونانی و رۆمەوە، بە ئێمە گەییوە، مادەکان خۆیان بە خزمی (سەرمەتیەکان) زانیوەو داناوە. هاوارو نەعرەتەی شەڕی هەندێ لە سکاکان و ساورماتەکان: "مێران مێران" واتە "پیاو بەرانبەر پیاو" بووە. کورد تا ئەمڕۆش بە پیاو دەڵێن "مێر".

هەروەها لە لەشکرکێشیەکەی داریوشدا بۆ سەر وڵاتی سکاکان لە تراکیە، هیرودوت لەوێدا باسی وڵاتی کوردەکان دەکات و ئەوە روون دەکاتەوە کە وڵاتی سکاکان جگە لە ناوچەکانی هەوەڵجاری خۆیان بەشێکی (تراکیە)شی گرتووەتەوە. (گوت)ەکان کە هاوشێوەی وشەی گوتییە، لە نێو سکاکاندا بووە.

دیارە زوبان فاکتەری یەکەم و بنەڕەتیە بۆ ناسینەوەی نەژادو میللەتان، بە مەرجێ ریشەی زمانی کۆنی ئەو نەژادو میللەتە بدۆزرێتەوە.

بە گوێرەی باوەڕی رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (دارمس تیتر)، زمانی کوردی و پشتویی ئەفغانی بەرەنجام و زادەی پەردسەندنی زمانی (ماد)ن.

لە ڕاستیدا هەر چەندە زۆر وشەی سامی و تۆرانی تێکەڵ بە زمانی ماد بووەو بە درێژایی ڕۆژگار گۆڕانی گەورەی بەسەر هاتووە، کەچی بەو حاڵەشەوە هەر لە زمانی کوردی نزیکە.

زەردەشت، ئەو بلیمەتە گەورەیە، پێغەمبەری ئارییان، لە (ماد)و لە تیرەی (ماژ) بووە، چینی ڕۆحانی لە ئایینی زەردەشتیدا کە (موغ و ماژوس) یان پێگوتراوە، ئەم ناوەیان لە تیرەی زەردەشتەوە، (موگ moge، موژ)ەوە وەرگرتووە. کتێبی (تعلیم و تربیت ایران باستان) دەڵێت: "ماد، ماژ، ماژ، موغ و ماگوش کە لە زوبانی عەرەبیدا بووە بە (مجوس) بە مانای زاناو پیتۆڵە، وشەی (ماژیك) لە لای ئەوروپاییەکان، مەعنای سەر سوڕهێنەرە. (ماژستە) بە مەعنای پایەبەرز و شایستەو خاوەن شکۆ دێت". هەروەها لە شوێنێکی دیدا دەڵێت: "لە گاتاکاندا کە کۆنترین بەشی ئاوێستایە و دراوەتە پاڵ خودی زەردەشت، وشەی (ماگا) بە مانای گەورەو مەزن بەکار هێنراوە. (بڕوانە یسنا ٦٥- ٧٠) لە هیچ شوێنێکی ئاوێستادا بە شێوەی ڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ زنجیرەی موغان نەکراوە... بەڵام بە شێوەیەکی گشتی گۆڕانی زمانەوانی ماژ، ماد، ماژ، ملك و گەردانی ئەو وشانەی چەمکەکانیان لە ڕووی لایەنی کەهانەتەوە (ئاینییەوە)یە... هتد".

لێرەدا (ماگا) کە بە مەعنای گەورە بەکار هێنراوەو پاشان بووە بە (مازا)، لە شێوەی کرمانجی ئەمڕۆدا بووە بە مەزن کە بە مانای گەورەیە.

ناوی ئەسڵی زەردەشت هەرچییەك بووبێ، پێیان گوتووە (زرتوش راسپی تمە) کە بە مانای (زەردەشتی سپی نەژاد) بووە.

ئەم وشانە کە زمانی میللەتی زەردەشت، واتە زمانی ماد بووە لەگەڵ کوردی ئەمڕۆدا جیاوازییەکیان نییە، "زەرتوش راسپی تمە" لە زمانی کوردی دا بە مانای تیشکی زێڕینی هەتاو دێ.

| مادی | کوردی | فارسی |
|---|---|---|
| زر | زەر | زرد، گلائی |
| تش | تیش، تیژ | شید، شعاع |
| را | را، رو | افتاب |
| سپی | سپی | سفید |
| تمە | تم | دستە، تیم |

ئەگەر عیبادەتکردنی زەردەشتیان لە دەرێی میحرابدا بە هەتاوەوە گرێ بدەین، ئەوا دەتوانرێ بگوترێ لەبەر ئەمە لەقەبی (زرتوشرا)یان لە پێغەمبەری خۆیان ناوە. دیارە ئەم وشەیە ناو نەبووە، بەڵکو لەقەب بووە، کتێبی: (سیر تمدن و تربیت در ایران باستان) لەم بارەیەوە دەڵێت لە زەمانی ئاوێستایی دا بە سەرۆکی پیاوانی ئاینی گوتراوە (زرتشترەتمە). ئەم پلەو پایەیە بە ویراسەت بووە.

لە نێوی کوردانی ئێزیدیدا تا ئەمڕۆش ئەم پرەنسیپی ویراسەتبوونەی پایەی ئاینی هەر ماوەو پەیڕەوی دەکرێت. سەرۆکی (موبەدانی موبەدی گەورە) کە لەقەبی (زرتشترەتمە)ی هەبووە لە (ڕەی) دادەنیشت. داریوش لە نووسراوەکانی بێستوندا (رەی، رگا)ی بە شارێکی (ماد) ژماردووە.

(ابو ريحان بيرونی) لەقەبی (مسمغان، مزمغان) بە (موبەدەکان) دەدا. (مس، مز)ی پەهلەوی لە فارسیدا (مە)ـە، واتە گەورە، کەواتە (مزمغان) دەکاتە گەورەو مەزنی موغان.

زەردەشتیەکان باوەڕیان وایە کە مەهاباد زەردەشتی یەکەمە، هوشنگ کە ئاگری دۆزیوەتەوە زەردەشتی دووەمەو دوا زەردەشت کە بە زەردەشتی سێیەمی لە قەڵەم دەدەن ناوی ئیبراهیم بووە.

ئەنسلکوپیدیای جولەکە، لە دایکبوونی ئیبراهیم بە (٢٠٠٠- ١٥٠٠ پ.ز) تۆمار دەکات.

پرسك، لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی خۆیدا، ساڵی لە دایکبوونی زەردەشتی بە (٥٩٩ پ.ز) داناوەو ساڵی بە پێغەمبەر بوونەکەی بە (٥٥٩ پ.ز) داناوە. هەندێ لە توێژەرەکانیش ئەم بۆچوونەیان قەبوڵ کردووەو پێیان وایە کە زەردەشت لە سەدەی پێنجەمی پ.ز سەری هەڵداوە کە ئەمە لەگەڵ حەقیقەتدا ناگونجێت.

ئەفلاتونی فەیلەسوفی نێودار کە لە ساڵانی (٤٢٩- ٣٤٧ پ.ز) ژیاوە، زەردەشتی بە دامەزرێنەری ئاینی موغ داناوە، شاگردەکانی ئەفلاتون دەڵێن زەردەشت، شەش هەزار ساڵ بەر لە مردنی ئەفلاتونی مامۆستایان، هاتووە. هورمودر- Hormoder دەڵێت زەردەشت پێنج هەزار ساڵ بەر لە جەنگی یۆنان و ترياس هاتووە. یانی شەش هەزارو سەد ساڵ پ.ز هاتووە، (بروسوس)ی مێژوونووس و پێشەوای نێودار کە لە سەدەی سێیەمی پ.ز ژیاوە، زەردەشت بە سەرەتای ئەو زنجیرە پاشا مادانە دەزانێ کە لە ساڵانی (٣٠٠٠- ٢٢٠٠پ.ز) لە (کلدە)دا حوکمڕانیان کردووە.

کفالیون، له (کتزیاس)ی دکتۆری ئەڕدەشیری دووەمی هەخامەنشیەوە کە لە سالآنی (٤٠٤- ٣٦١پ.ز) دکتۆری دەرباری پاشای ناوبراو بووە، دەیگێڕێتەوە کە زەردەشت هاوچەرخی پاشای ئاشور (نینوس و سەمیرئەمیس)ی ژنی ئەو پاشایە بووەو باسی لەشکرکێشی ئەم پاشا ئاشوریە بۆ سەر پاشای رۆژاوا دەکات کە نێوی زەردەشت بووە، (بڕوانە کتێبی ادبیات مزدیسنا پشتها، رۆژاوای ئێران خوراسان نیە بەڵکو کێوەکانی زاگروسە).

جا چونکە موبەدانی موبەدی گەورە لەقەبی (زرتشترەتمە) بووە، رەنگە ئەو پاشایەی رۆژاوا زەردەشت نەبووبێ، بەڵکو موبەدی موبەدانی گەورە بووبێ.

لە کەتیبەیەکی (بەردەنووس) ئاشوریدا کە هی سەدەی هەشتەمی پ.ز نێوی کابرایەکی مادی دەبرێت کە (مەزدەك)ی ناو بووە. لەم بەردەنووسەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە لەسەدەی هەشتەمی پ.ز ئاینی (مەزدا پەرستی) لە نێو مادەکان باوی بووە. جەنابی (پورداود)ش رای وایە کە ناوی پاشایانی ناوێستا میناکی: کەیقوباد، کەیخوسرەو، لهراسب، گشتاسب چ پەیوەندییەکی بە دیاکو، کوروش و ئەوانی دیکەوە نییە.

بە گوێرەی نێوەڕۆکی ئاوێستا، زەردەشت لە سەردەمی گشتاسب دا بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کردووە، گشتاسب بابی داریوش بووە، پاش سەڵتەنەت و دەسەلأتی مادەکان هاتووەتە سەر تەخت. خۆ ئەگەر زەردەشت لە سەردەمی هەخامەنشیەکاندا زندوو بوایە ئەوا بێگومان لە ئاوێستادا باسی دەسەلأت و ناوی پاشایانی مادی هەخامەنشی دەکرا... کەچی هیچ باسێکی ئەوانی نەکردووە. تیگلات پلیسری پاشای ئاشور کە بەر لە مادەکان حوکمڕانی کردووە، لە بەردەنووسێکدا (کەتیبە) باسی ویشتاسب-گشتاسب دەکات کە سەر حێڵی کموخ پاکموك بووە. بەم پێیە بەر لەوانیش سەران و پاشایانێك

بەو ناوانە هەبوونە. (قەلایەکی کۆن لە کوردستانی تورکیادا هەیە ناوی کماخ)ە، بە گوێرەی ئەمە بێ دەبێ بگوترێ زەردەشت بەر لە مادەکان بووە بە پێغەمبەرو کۆچی دوایی کردووە. هەمەدان، کە پایتەختی مادەکان بووە، تیگلات پلیسری یەکەم. لە ساڵی هەزارو سەدی پ.ز نێوی ئەم شارەی هێناوەو (ئامدانە)ی پێگوتووە. (بڕوانە تاریخ مشیر الدولە). لە ئاوێستادا ئەمە باس نەکراوە، لە (زامبادپشت)دا بەندی نۆیەم، هەوەڵجار درووود بۆ (هیوسرەوە –کەیخوسرەو- نێردراوە و پاشان بۆ دەریاچەی (هیوسرەو) درووود نێردراوە.

فەسڵی بیست و دووی بوندهش، بەندی هەشت دەڵێت: "دەریاچەی هیوسرەو کەوتووەتە پەنجا فەرسەخی دەریاچەی چیچیست –ڕەزاییە-". (وست) ئەگەری ئەوە دادەنێ کە ئەم دەریاچەیە، دەریاچەی (وان یا سوان) بێ. کەیخوسرەو پێویستی بە (ناهید)ی فریشتەی ئاو بووەو لە ڕەخی ئەم دەریاچەیەدا، بەو مەبەستەی مرازی بێنێتە دی، سەد ئەسپ، هەزار سەرگا و دە هەزار سەر مەڕی بۆ کردووەتە قوربانی. بەمەدا دەردەکەوێ کە مەڵبەندی (هیوسرەوە)ی زەردەشت لە نزیکی دەریاچەکانی ڕەزاییە و وان بووبێ و پەیوەندی بە کەیخوسرەوی هەخامەنشییەوە نەبووە. لە ڕاستیا زۆربەی زانایان، ڕۆژهەڵاتناسان و مێژوونووسان باوەڕیان وایە کە زەردەشت لە ساڵانی (١٢٠٠- ٨٠٠)دا هاتووە.

کتێبی (ادبیات مزدیسنا پشتها) نووسیویەتی: "لەو سەردەمەدا کە ئاوێستا نووسراوە، هێشتا بە دانیشتوانی ئێرانی گوتراوە ئاریا. پارەو دراو باوی نەبووە، مامەڵە بە کەلوپەل کراوە، برونز باوی هەبووە، چ هەواڵێك لە ئاسن نەبووە". بەڵام ئەگەر سەرنجێکی ناوی (گهمورپ) بدەین کە لە ئاوێستادا بە

(ئەزینەونت) نێو براوە و بە مانای (چەکدار) هاتووە، و ئەگەر وشەی (ئاسن، هەسین)ی کوردی لەگەڵ (ئەزن)دا بەراورود بکەین، ڕەنگە بتوانین بڵێین ئاسنیان ناسیوە. ئەوەی پێویستە لێی بکۆڵرێتەوە کتێبی نێوبراو باسی دەوڵەتانی ئاشور، سومەر، گوتی، کوسی، خالدی، نایری، سوباری... هتد نەکردووە، تەنیا ئەوە نەبێ (گیومرپ) بە (گیو مرت) ناو دەبات و نێوی گوتمە، گیوتم و گیوش دەبا کە دەشێت ئەوان بە گوتی و کوسی)یان بزانن. هەروەها ناوی دۆستان و یاوەران و هاورێیان و بنەماڵەکەی خۆی کە (مدیومانگهە سپیتم)ی پێگوتراوە، هێناوە کە پاشان بووە بە (مدیومانگهە و مدیوماه). دەشێت بگوترێ مەبەست لە (مدیو) هەر (ماد) بووە کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا وشەی (ماد) بە (ماه) تەلەفوز کراوە. لە ڕاستیدا (مانگهە) مەعنای (مانگ بووە، کە کوردەکان تا ئەمڕۆش بە (ماه) دەڵێن (مانگ). لە ئاوێستادا ئاماژە بۆ شارێك کراوە بە نێوی (بوری) کە بە قەرینە دەبێ بابل بێ، بەم پێیە ئەو پاشایانەی کە لە ئاوێستادا ناویان براوە هی بەر لە مادەکان بوونەو مەیدانی چەلەنگی و چالاکیان باکووری ڕۆژاوای ئێران بووە، واتە دەوروبەری ڕەزاییەی زاگەی زەردەشت بووە.

لە ئاوێستادا بە دێوی دژمن و لەنێو بەری دینی یەکتاپەرستی گوتراوە (مەرشەیون – mercheon)، کوردیش بە سەرۆکی ڕۆحانیانی ئاسوریەکان دەڵێن (مەرشەمون) کە لەوەیە لە (مەرشەیون)ەوە هاتبێ. دیارە ئاشورییەکان لە سنوورەکانی خێڵی زەردەشت بوونەو بانگەوازی ئەم پێغەمبەرەیان قەبوڵ نەکردووە، (مەرشەیون)ش کە لەقەبی سەرۆکی ڕوحانیان (پیاوانی ئاینی) بووە پاشان بڵاوبووەتەوەو بووە بە لەقەبێکی باو.

هەندێك پێیان وایە زەردەشت خەڵکی رۆژهەڵات بووە، کەچی یسنای بیست و شەش، بەندی یەکەم و دووەم دەڵێت: "بۆ کام وڵات هەڵێم، پەنا بۆ کوێ بەرم، پێشەوایان و ئەشراف لێم دوور دەکەونەوە، نە لە جوتێرو وەرزێران خۆشحاڵم و نە لە فەرمانڕەوایانی شار کە لایەنگری درۆن، ئەی مەزدا چۆن دەتوانم تۆ خۆشحاڵ بکەم، من دەزانم بۆ هیچم پێناکرێ، چونکە پەزو مەڕم کەمە، کرێکارانم زۆر نین".

زەردەشت کە بینی پەیامەکەی لە وڵاتی خۆیدا وەکو پێویست گەشە ناکات و دژمنایەتی دەکەن، ئیدی ناچار لەگەڵ چەند یاوەرێکی خۆیدا، بە گوتەی بارتلمە، سەری خۆی هەڵگرت، خۆی لە رێگەی ئاسایی پڕ خەڵك دزییەوەو بە کوێرە رێیاندا خۆی گەیاندە دەرباری (گشتاسب)ی پاشای رۆژهەڵاتی ئێران، ئەمە لە خودی گاتاکاندا بە (ویشتاسپ) هاتووە، (بڕوانە: ادبیات مزدیسنا پشتها).

(گات) لە شێوە زاری کرمانجی دا بووە بە (گاس، گاز) کە مانای بانگ کردنە. لە پەهلەویشدا (گاس)ـە، لە سانسکریتیدا (گاپا)یە. ئەمڕۆش لە شێوەزاری کوردی باشوردا (کات) بە مانای (زەمان، وەخت، دەم) بەکاردێ. جەنابی پورداود لە کتێبی "ادبیات مزدیسنا پشتها"دا دەنووسێت: "ئەمڕۆکە ج گومانێك لەوە نەماوە کە زمانی ئاوێستا هی رۆژاوای ئێران بووە نەك هی رۆژهەڵات و باشووری رۆژاوای ئێران".

حەزرەتی زەردەشت، پێغەمبەری ئارییان، کە لە نێو رۆڵەکانی کوردەوە سەری هەڵداوە، لە رۆژی هێرشی تۆرانییاندا، کە ئەوانیش هەر ئاریایی بوونە، لە ئاتەشکەدەی بەلخدا شەهید بووە.

وشەی (مها) لە سانسکریتیدا واتای گەورەیە. هەر هەمان وشە لە ئاوێستادا بووە بە (مازا) بەشی یەکەمی وشەی (مزدا) لە (مازا)وە هاتووە کە کوردەکان تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش هەر وشەی (مەزن) بۆ ئەو مانایە بەکار دێنن. کوردەکان بۆ هەمان مانا وشەی (گەورە)ش بەکار دێنن کە هاوشێوەی وشەی (گروس، گراند)ی ئارییەکانی ئەوروپایە. (گری) لە ئاوێستادا بە مانای (کێو) بەکار هاتووە، لە پەهلەوی دا بووە بە (گیر) لە کوردی ئەمڕۆشدا (گر)ە، ئەفغانیەکانیش پێی دەڵێن (غیر).

(ئەنزان) بە مەعنای کوێستان بەکار هاتووە، کوردیش (زوزان) واتە کۆجاڕی بەرزو کوێستان، بەکار دەهێنن. بە زمانی میتانی بە شەڕڤان و جەنگاوەر گوتراوە (ماریا) و بە فەرماندەی جەنگاوەرەکانیان گوتووە (ماریانو) کە کوردیش وشەی (مێر) بۆ ئەو مەبەست و مانایە بەکار دێنن. ئەم وشەی (مێر)ە لەگەڵ (امیر)ی عەرەبیدا تێکەڵ بووە، کەچی وشەکە، وشەیەکی کۆنی ئارياییە. ڕەنگە عەرەبەکان لە ئارییەکانیان وەرگرتبێ و لە قاڵبی زمانی خۆیان دابێ و بووبێ بە (امیر).

(هری) کیسەیەکی لە خوری دروستکراو بووەو لە ئاهەنگە ئاینییە کۆنەکانی ئارییەکاندا بۆ پاڵاوتنی شیلەی گیای (هوما) بەکار هێنراوە، کوردانی ئەمڕۆکەش بە خوری مەڕ دەڵێن: (هری).

شاد ڕەوان عەبدولەجید خان ملك الكلام کوردستانی باوەڕی وابوو، گیایەك نەبووە ناوی هوما بووبێ، بەڵکو (ئوما) بووەو مانای (دار مێو) بووە کە ئاوی ترێیان گرتووەو شەرابیان لێ دروست کردووەو خواردوویانەتەوەو مەست بوونە. بۆیە بە خۆڕایی بە دوای دۆزینەوەی گیای هومادا دەگەڕێن، گیایەك بەم ناوە (هوما) نەبووەو نینە!.

(ئاندرا) کە ناوی یەك لە خوایەکانی ئاریایی هندو —ئێرانی بووە، لە دەقی ئاوێستاوە دەردەکەوێ کە پاشان لە ناو ئێرانیەکاندا مانای بەدو کرێتی وەرگرتووە، لە کوردستان باکووردا، بە تایبەتی لەنێو خەڵکی ئەرزرۆم، وان، بەتلیسدا بە بەدو کرێت دەڵێن (ئاندر).

لە بەردەنووسەکانی داریوشدا، (هیکمتان) نێوی پایتەختی مادە، کورد بە هێلکەی مریشك دەڵێن (هیك) ڕەنگە ئەم شارە لەبەر جوانی خۆی بە کینایە پێی گوترابێ (هێکمەتان).

قەسری شیرین، کە ناوی هەوەڵینی (دەستجرد، دەستکرد) بووە، یۆنانیەکان پێیان گوتووە (ئارت میتا).(ئارت) لە زمانی لاتینی دا مەعنای هونەری تەلارکاریە. لەم دوو ناوەوە یەکێتیی زمانو وشەیەلی میتان و ماد بە دیار دەکەوێ. (دەستکرد) یەکێك بووە لە کۆشکەکانی سەڵتەنەتی خوسرەو پەرویز. (ئارت) لە ئاوێستادا بە واتای: دەوڵەمەند، بەخشایش، بەرەکەت و فەڕ، نیعمەت، هەقدەست و مز، پاداشت و سوود هاتووە، هەندێ جاریش ناوی تایبەتی ئەو خوایەیە کە نیگابانی سامان و دارایی لە ئەستۆی ئەودا بووە.

(ئارت) یەکێکە لە خواوەندەکانی ئاینی زەردەشتی کە لەگەڵ گاتاکاندا نێوی براوە. (دارمیس تیتر) لە ئاوێستا تەرجەمە کراوەکەی خۆیدا، لە (بوندهش)ی گەورەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: ئارت، (یەزدان خانەیەکی بەهەشتە) (بڕوانە کتێبی: ادبیات مزدیسنا). بەم پێیە ئارت میتا، بە مانا لاتینیەکەی هونەری تەلارکاری میتا دەگەیەنێ و بە مانا ئاوێستاییەکەی (یەزدان خانەی بەهەشت) دەگەیەنێ یا خوای نیگابانی سامان و دارایی میتا

دەگەیەنێ. بەڵام لێرەدا چونکە یونانیەکان ئەم ناوەیان لێناوە بە مانای هونەری تەلارکاری دێت.

جا زێدەباری ئەوانە و بۆ زانیاری پتر وا ئەم خشتەیەی خوارەوە، لە کتێبی تاریخی کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگ وەردەگرین و وەکو خۆی دەینووسینەوە:

| کوردی سلێمانی | کوردی کرمانجی | ئاوێستایی | فارسی ئەمڕۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| گەورە | مەزن | مازا | بزرگ |
| بەرز | بەرز | بەرەزا | بلند |
| ماسی | ماسی | ماسیا | ماهی |
| حوشتر | شوشترا | شوشترا | شتر |
| پرد | پرت | پرەتا | پل |
| رۆژ | رۆ، خۆر | هور | افتاب، خورشید |
| بەراز | وەراز | ورازا | گراز |
| مێش | مژ | مەخشی | مگس |
| بەرخ | بەرخ | وراخا | بره |
| قسە | کسە | خسا | حرف، سخن |
| ویستن | ویسو | واس | خواستن |
| زانین | زانین | زانین | دانستن |
| من | ئەز | ئەزم | من |
| من (مچاف الیه) | منا | مینا | من، مرا |

لەو نموونانەی سەرێڕا دەردەکەوێ کە کوردەکان وەکو چۆن میراتگری خاکی مادەکان بوونە، بە هەمان شێوەش میراتگری زمانی مادەکانن.لەو ناوچانەدا کە ئەمڕۆ کوردی لێ نیشتەجێن، لە بەرەبەیانی مێژووەوە میللەتی گوتی، گوتی تێدا بووەو حوکمڕانیان کردووە، ئاشوریەکان لە کەتیبەیەك دا (کورتی)یان پێگوتوون. پاشان کوسیەکان لەو ناوچانەدا پەیدا بوونە، لە کتێبی پیرۆز و ڤیدادا وشەی گوتی، گوتمەو لە ئاوێستادا گیوتم)ـە.
وشەی کوسی کە (کوش)شی پێگوتراوە. لە ئاوێستادا گیوشەیە، وەکو گیوتە مەعنای گا بووە. بەم پێیە گیوشە و گیوتە یانی کوسی و گوتی یەك مانا دەگەیەنن و لە فۆنەتیکا هاوشێوە بوونە. چونکە لە ئاسەوارە کۆنەکاندا گوتە بە گوپە خوێندراوەتەوە بۆیە دەبێ گوتە، گوپە، گوشە بە نێوی یەك میللەت بزانرێن.
بەڵگەی لەمەش بەهێزتر ئەمەیە کە پاشای (ئەنزان)ی نیشتمانی کوسی، کاسیتەکان، بە خۆی گوتووە (تخی خی گوتو) بە گوتەی لێکۆڵەرەکانیش، کورد:

١- وەچەی گۆتیەکانن.

٢- کوسی، کاسیتان ئەژدادی کوردن.

٣- مادەکان، تیرەی کورد بوونە.

٤- نیشتمانی گوتی و ماد، لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ نیشتمانی کوردان بووە.

بەم پێیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە گوتی، کۆسی ناوی یەك میللەت بووەو مادەکانیش لەوان و لە عەشایەرو خێڵی کورد پێکهاتووە.

(مشير الدوله)ی رەحمەتی لە مێژووەکەی خۆیدا دەڵێت: هەندێ پسپۆرو ڕۆژهەڵاتناس دەڵێن زمانی میللەتی ماد، زمانێکی بتەوو بناغەدار بووەو زمانی کوردی ئێستا بووە.

لە سەرێرا ئاماژە بۆ ئەوە کرا بوو کە (دارمیس تیتر)ی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی هەم زمانی کوردی و هەم زمانی پشتویی ئەفغانی بەزادەی گۆڕان و پەرەسەندنەکانی زمانی ماد، زانیوە. بەم پێیە نەك هەر مادەکان، بەڵکو هەموو ئەو خێڵ و تایفانەی کە لە ناوچەکانی کوردستانی ئێستادا دەوڵەتیان دامەزراندووەو حوکمڕانیان کردووە، وەك: لولوکان، گۆتیەکان، کوسیەکان، خالدیەکان، نایریەکان، موشکییەکان، میتانەکان، کارداکان و کالپاتەکان و تیرەکانی دیکەی کە پاشان هاتوونەتە ئەم ناوچانە وەك سکاکان و گمیریەکان و کادوسیەکان و گورگانیەکان، هەموویان ڕژاونەتە ناو دەریای (کورتی- کورد) و بە گشتی ناوی کوردیان لە خۆ گرتووە. جا لەم حاڵەدا دەبێ بە مەزنەندە بگوترێ:

١- عەرەبەکان، هەوەڵجار دەگەڵ تیرەی (کاردا، کورتی، زاکارتی)دا تێکەڵاویان پەیدا کردووەو چونکە نێوی ئەو تیرانە هەموو لە یەکدی چوونە، ئیدی عەرەب بە هەموویان گوتوون کورد.دوایەش کە ڕووبەڕووی تایفەو تیرەی کۆسی و ئەوانی دی بوونەتەوە سەیریان کردووە زمان و داب و نەریت و ڕەوشت و خدەو خووی جەنگاوەرانەی ئەوانی تریان هەیەو لە نێو ئەم تیرەو تایفانەدا —واتە کوسی و ئەوانی دیدا- کورتی زۆر هەبوونە نێوی کوردیان لە هەموو ئەوانیش ناوە. جا چونکە ئێرانیەکان بە جەنگاوەرو پاڵەوانیان دەگوت (گورد)و ئەو پاڵەوانانەی کە لە نێو ئەم تیرەو خێڵانەوە دەهاتنە مەیدان و مێرخازییان دەکرد، هەموو وشەی (گورد)یان

دەکرد بە پاشکۆی ناوی خۆیان و بە خۆیان دەگوت: (.... گورد)، لە راستیا ئەمانە جەنگاوەرترین و قارەمانترین خەڵکانێك بوون کە تا ئەو رۆژە عارەب رووبەڕوویان بووبوونەوە.

بەم پێیە سەبارەت بە لەقەبی (گورد) کە لەگەڵ حاڵ و ئەتواری ئەو خێڵ و تایفە کورد رەگەزانەدا باشتر تێك دەگەنەوە و لە هەمان کاتدا چونکە وشەی نێوبراو (کورد) لەگەڵ ناوی تیروتایفە نێو براوەکان دا گونجاو و لە بار بووە، بۆیە عەرەبەکان هەر هەموویان بە (کورد) ناو بردوون و لێرەوە ناوی کورد بڵاوبووەتەوە. کە پێشتر پێیان گوتراوە کوسی و ماد بە یەکجارەکی لە نێو چووەو وشەی ماد کە بووە بە (مای)و پاشان بووە بە (ماه) و بووە بە ناوی جوگرافیایی ناوچەکانی کوردستان.

بەر لە ئیسلام، حوکمڕانی و دەسەڵاتی ئێران بە دەستی ساسانیانی کوردەوە بووە، کوردەکان بە زەبری جەنگاوەری و عەگیدی خۆیان، خزمەتی فرەیان لەڕای شکۆو پایەی دەوڵەتی خۆدا دەکرد. ئەوانە رێزو ئیحتوباری خۆیان هەبووەو ئەمەش کردویەتێ کارێك کە نێوی کورد پتر بڵاوببێتەوە.

شانامە، کوردەکان بە میللەتی جەمشید دەزانێ و بە وانەیان دەژمێرێ کە لە زوڵم و زۆری زوحاك و بە هۆی هەردووك وەزیرەکەیەوە، واتە ئەرماییل و کەرماییل، هەڵاتوون، پەنایان بردۆتە بەر کێوەکانو شانامە لە پەسنی مەردایەتیاندا دەڵێت: جل و سامانیان سەرانسەر پەڵاس، دلێرو چاو قایم لە خواش نەترس.

فیردەوسی، پاش ئەوەی کوردەکان پەنایان بردووەتە بەر کێوەکان، کە هۆکارەکانی ئەم پەنابردنە باس دەکەم، شانامەی نووسیوە، بارودۆخ و ژیان و گوزەرانی ئەم میللەتەی وەکو چۆن لە دەوروبەری خۆیدا دیتوە،

وەسفکردووە. بەمجۆرە لە نێوە دێڕی دووەمی شیعرەکەدا ئاشکرایە کە وشەی (کورد) لە راستیا لەبەر رەشیدی و جەنگاوەری ئەم تیرەیە بووەو وشەی (کورتی) داپۆشیوەو لەوشەی (گورد، کورد)ا دەرکەوتووەو بەرجەستە بووە.

ستڕابون، لە کتێبی پانزدە، بەندی هەڤدەیەمدا دەڵێت: لاوانی پارس بە جۆرێ پەروەردە دەکەن کە لە سەرماو گەرماو باراندا بەسەبرو وەرزشوان و تۆکمە بن، و شەوان لە هەوای ئازادا خەریکی مالآت بەخێوکردن بن و خواردنی جەنگەڵی میناکی بەڕوو و شتی دی بخۆن، بەمانە دەڵێن (کوردەك) و خەڵکی (کوردەك) لەسەر تالآنی و چەتەیی دەژیان و (کوردا) مانای پیاوی شەڕڤان و دلێر دەگەیەنێ.

هەر چەندە هەندێ مێژوونووس باوەڕیان وایە کە (کوردوکان) نەوەو وەچەی (کارداکان) نین و تیرەیەکی دیکەی ئارایایی نەژادن، کە پاشان کۆچیان کردووە بۆ سەر زەمینی کاردۆ و نێوی شوێنەکەشیان لە خۆ گرتووە، بەلآم ستڕابوون دەڵێت: میللەتی (گوردین) کە وەچەی میللەتی (کاردۆن) لە بەشی کەناریی دیجلەدا نیشتەجێن، جا چونکە دەوڵەتی ئاشوری لە ساڵی (٦١٢ پ.ز) بە دەستی (هوخشترە)ی پاشای بەزەبر و دەسەلآتی ماد روخاوە، بۆیە میللەتی (کورد- ماد-) ئەم مێژووەی بە سەرەتاو دەستپێکی مێژووی خۆی داناوە.

ئەو مێژوونووسانەی باسی کوردیان کردووە، ئەگەری ئەوە دادەنەن کە کوردەکان لە ساڵی (٦٥٠ پ.ز) هاتبنە کوردستان، لە کاتێکا ئادادنیراری سێیەم پاشای ئاشوری (٨١٢ پ.ز) دەڵێت کوردەکانی باکورم تەمێ کرد. (مستر هول)ش باوەڕی وایە کە کوردەکان زۆر پێش (٦٥٠ پ.ز) لە کوردستاندا

بوونە. لەو سەردەمەدا کە ئاشوریەکان باسی (کارداو کورتی)یان وەکو دراوسێی خۆیان کردووە، ڕۆژهەڵاتناسان شوێنی عێلی گەورەی (کورتی)یان بە ڕۆژهەڵاتی ئێران داناوەو تەنیا زاگروتیەکانی ئاکنجی ناوچەی کەرکووك، دراوسێی ئاشورییەکان بوونە.

١- ئارامیەکان، بە ناوچەی (کاردو)یان گوتووە (کازارتا- کاردو) کە کازارتا هەر (زاکارتاو ساکارتا)یەو تیپە گۆڕکێی تێدا بووەو ئاشوریەکان پێیان گوتووە (زاگروتی) مێژوونووسان و ڕۆژهەڵاتناسان زاگروتیەکانیان بە تیرەیەك لە (کورتیەکان) ڕۆژهەڵاتی ئێران زانیوە، بەلام ئەگەر (زاکارتا)و (کازارتا) بە یەك بزانین، ئەوا هەقی خۆیەتی بگوترێ شوێنی کۆنیان دەوروبەری دیجلە بووە، هەڵبەتە لەگەڵ (کورتیەکان)ی ڕۆژهەلاتی ئێراندا یەك میللەت بوونەو دوور نییە بەشێك لە زاکارتیەکانیش لە نێو (کورتیەکان)یرۆژهەلاتی ئێران بووبن.تیرەیەکیش لەو کوسیانەی کە لە کەناری دەریای خەزەر بوونە، دوو هەزار ساڵ پ.ز هاتوونەتە لوڕستان و پاشان (بابل)یان داگیر کردووەو دەوڵەتی (کاردونیاش)یان دامەزراندووە. ئەم تیرەیە ناوی (کاسیت) بووە، کەهاوشێوەی (کازارت، کازارتا)یە. پاشان تێکەڵ بە یەکدی بوونەو تازە هاتووەکانیش ناوی کاردویان گرتۆتە خۆ.

٢- فارسەکان لە کۆندا بە خەڵك و لەشکریان دەگوت (کارا)، بە خەڵك و لەشکری مادیان گوتووە (کاراماد) کە بەرە بەرە وشەی (کارا) و (کوڕ) کە لە کوردیدا بە منداڵی نێرینە دەگوترێ، تێکەڵ بووەو بووە بە (کورماد) کە لەگەڵ وشەی (کورتی، کوردو زاکارتی)دا کە هاونەژاد و هاو میللەت بوونە، ئیدی وشەی کورد هەموو میللەتی مادی گرتووەتەوە.

٣- ئەوەی لەو دوو بۆچوونە دروست دێتە بەرچاو ئەمەیە: سترابون، لە کتێبی پانزە، فەسڵی سیانزەدا نێوی ئەو تیرەو تایفانەی تۆمار کردووە کە دەوڵەتی مادیان دامەزراندووە و گوتوویەتی (کورتی و مرد) گرنگ ترینیانن. بەم پێیەو بە گوێرەی قسەی پولیپ، پاش تەواو بوون و نەمانی سەڵتەنەتی ماد، کورتیەکان کە لە مادستاندا زۆربە بوونە، ناوی تیرەکانی تریان کردۆتە ژێرەوە و بە هەر هەموویان گوتراوە (کورتی، کوردو)و پاشان عەرەبەکان بە هەموویان گوتووە (کورد).

ئێمە لێرەدا کارمان بەوە نییە کە چۆن وشەی (ماد) بووە بە کورد، یا وشەی ماد بووە بە (مای و ماه)، ئەوەی چ گومانێك هەڵناگرێ ئەمەیە کە میللەتی ماد پاشان لە ژێر سەر ناڤی کوردا ناسراوە، واتە بە کورد ناسراون.

لە مێژووی ئەرمەنیەکاندا بە ناوچەی سلماس –شاهپوری ئێستاو خوی، رەزاییە گوتراوە (کورچیخ) کە مانای (کورد)ە، تا ئەمڕۆ خێلی (کورمانج) لەو ناوچانەدا نیشتەجێن. شارێکی کۆن لەو ناوچانە هەبووە کە تا ئەم دواییانەش (دیلمان)ی پێگوتراوە، هەروەها (دیلمانج، دیلمقان)یشی پێگوتراوە. پاش بوومەلەرزەیەك ئەو شارە وێران بووەو شارێکی تازەیان لە شوێنی دامەزراندووەو ناویان ناوە (شاهپور)، بە قەرینە وشەی (دیلمانج) لە نێوی تایفەی (مان، مانج، موغ)ەوە وەرگیراوە کە بە زمانی کوردی (دیلمان، دیلمانج، دیلمقان)ی پێگوتراوە.

(دیل) لە زمانی کوردیدا مانای (یەخسیر)ە. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە (مان، مانج، موغ) هەرسێکیان ناوی یەك تیرە بوونەو ئێستا ناوی (کورمانج)ی گرتووەتە خۆ.

ئەگەر هەندێك لەو خشتە بەراوردکارییەی زمانی کوردی، ئاوێستایی، فارسی، کە پێشتر تۆمارمان کردبوو، ورد ببینەوە، دەبینین شێوەی کرمانجی لە شێوەکانی دی نزیکترە لە زمانی ئاوێستایی، واتە لە زمانی تایفەی زەردەشت و موغەکان، هەر لەمەوە دەکرێ ئەو ئەنجامگیرییە بکرێ کە تایفەی کرمانجی ئێستا لە تایفەی پێغەمبەری ئارییان (ماژ- موغ)ـە، رەنگە ئەم تیرەی (ماژ)ـە ئەو (ماننائی)یە بێ کە لە باشووری رۆژاوای رەزاییەدا نیشتەجێ بووم، بەردەنووس و کەتیبەکانی ئاشوورییان، ئەمانەی بە خزمی مادەکان دا ناوە.. زەردەشتی بلیمەتی مەزن و مایەی شانازی ئاری نەژادان، خەڵکی ناوچەی چیچیست —رەزاییەی ئێستا- بووە ئەمرۆکەش لە باشووری رۆژاوای رەزاییە، واتە لە نیشتمانی ماننائییەکاندا، ناوچەیەك هەیە بە نێوی (سەردەشت) کە رەنگە لە بنەڕەتدا زەردەشت بووبێ. تایفەی زەردەشت ناوی (ماژو موگ) بووەو دیارە ناوی چینی رۆحانیانی زەردەشتیان کە موغ و ماجوس بووە لە نێوی تایفەی زەردەشتەوە وەرگیراوە. رەچەڵەکی زەردەشت دەگەیەننەوە سەر مەنوچەهری نەوەی فەرەیدوونی گورد. لە لێکۆڵینەوەی ناوی پاشاکانی ناو شانامەدا گەیی بووینە ئەو ئامانجەی کە (مەنوچەهر- منواش) پاشای ئارارات بووەو دەسەڵاتی بەسەر خاکی (ماننایی)شدا هەبووە. دیاکۆی پاشای ماد، لە تیرەو هۆزی ماننائی بووەو لەلایەن بابیەوە کرابوو بە پاشای ئارارات.

مێژووە دێرینەکان رەچەڵەکی ئەم پاشایەش دەگەیەننەوە سەر مەنوچەهر کە پاشان بەڕای هەموو میللەت بووە بە پاشای (ماد) بە مەدا دەردەکەوێ کە (ماننایی) تیرەیەك بووە لە ماد.

هەر چەندە لە نێو لیستی ناوی تایفەکانی (ماد)ا وەکو هیرودوت تۆماری کردووە، وشەی (مانایی) بەرچاو ناکەوێ، بەڵام دیارە ئاشوورییەکان نێوی (مانی، مانژ mange)یان بە (ماننای، مانایی) خوێندووەتەوەو ئەم ناوە پاشان بووە بە (ماژ، ماك، موغ) یا هەر لە بنەڕەتدا لە تەرجوومەی بەردەنووسەکاندا هەڵەیەك رووی داوەو (مانژ، مانی) بە مانایی تەرجومە کراوە.

جا وەکو چۆن لە نیشتمانی مانناییەکاندا (موغ یا ماژ) دەبینین، لە نیشتمانی ئاراراتیەکانیشدا کە (مایەر) لە ئاراسی مەرکەزیدا کەشفی کردووە، تیرمیەکی ماد کە (ئارزانت)یان پێگوتراوە، دەبینین، لە خاکی (پارتا کۆنەکان)دا کە بریتی بووە لە کەنارێن باشوری دەریای خەزەر (پارتەکان) پەیدا بوونە کە فەرەنسیەکان (پارتیك)یان پێدەڵێن، گوایە ئەم (پارتا)نە بەماد ناژمێرن. کەچی (ئاسەر هەدون)ی پاشای ئاشور دەڵێت سێ کەس لە میر یا شاردارانی ماد: (ئوپیس)ی خەڵکی پارتکە، (رنەسانە)ی خەڵکی پارتوکا، (رماتیای) خەڵکی ئورگازابرنە کە بە باوەڕی هرتسفلد ئەم شارانە لە وڵاتی (پارتیاو- خوراسان- هرکانیا)دا بوونە. بە خوایشتی خۆیان دیاری و سەوقاتیان بۆ نەینەوا هێناوەو داوایان کردووە بکرێن بە حوکمڕانی وڵاتی خۆیان. ئیدی ئەم گوتەیە راست بێ یا درۆ، ئەوا بە پێی ئەو قەباڵە ئاشوریە دەبێ پارتەکان بە ماد بزانرێن. داریوشی پاشاش لە بەردەنووسی (بێستون)دا دەڵێت: "داریوشی پاشا دەڵێت: "پارتۆو وورەکان) لە من یاخی بوون و پەیڕەوی (فرورتیش)یان کرد، خەڵکی (پارت)ش لە (ویشتاسب)ی بابم سەرپێچیان کرد".

فرورتیش لە بەرانبەر داریوشدا، ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکردووە، ویستویەتی سەڵتەنەتی ماد بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. هەڵبەتە دەبێ (پارتو و وورکان) ماد بووبن، بۆیە پەیڕەوی (فرورتیش)یان کردووەو لە بابی داریوش هەڵگەڕاونەتەوە. گەزنەفۆن لە کتێبی چوار، فەسڵی دوو، دەڵێت: "گورگانیەکان لە سنووری ئاشوردا ئاکنجین. ئاشوریەکان کاری زەحمەتیان پێدەکردن، لە شەڕدا چەند نوێنەرێکی ئەو گورگانییانە هاتنە نك کوروش و دەستیان لەگەڵدا تێکەڵکردو لە ئاشوریەکان هەڵگەڕانەوە، چونکە ئاشوریەکان، ئەوانیان –گورگانیەکان- بە پەیڕەوو تەبەعەی خۆ دەزانی، بە ئاسانی غافلگیر بوون و سوارەی مادو گورگانی دوای دژمنی شکاو دەکەوتن و تاڵانیان لێ دەسەندن". لە سەردەمی گەزنەفونیشدا گورگانیەکان وەکو پارس و مادەکان لە کاروباری دەوڵەتیدا بەشدارییان دەکرد... گورگانیەکان وا ناسراون کە لە باشووری رۆژهەڵاتی دەریای خەزەر بوونەو زۆر لە سنووری ئاشورەوە دوور بوونە، کەچی گەزنەفۆن دەڵێت لە نزیکی سنووری ئاشوردا بوونە. بەم پێیە دەبێ گورگانییەکان تایفەیەك بووبن لە کوسییەکان و بەشێکیان لەگەڵ کاسیتییەکاندا هاتوونەتە سنووری ئاشورو لەوێندەر ماونەتەوە و هەر بەم بۆنەیەوە بووە کە لەگەڵ (فرورتیش)دا یەکیان گرتووەو دژی داریوش هەستاون. هەروەها گەزنەفۆن دەڵێت، بابلییەکان قەڵایەکیان لەلایەن کادوسی و سکاکانەوە دروست کردبوو. ستڕابۆن، مەڵبەندی کادوسیەکانی بە باشوری دەریای خەزەر داناوە. هەروەها ناوی هەندێکیانی لە کۆجارەکانی ئازەربایجان، زاگرۆس و نیفاتس دا لەگەڵ ئەمردەکان و کورتییەکاندا هێناوە، بەمەدا وا دەردەکەوێ کە

لەگەڵ کورتیەکانـدا تـیرەو هـۆزی یـەك میللـەت بوونـەو لـە سـنوورەکانی (بابل)شدا هەبوونە.

روکاری کۆشك و مـەزارو گۆڕستانی پاشاکانیان بـەئارمێکی بازنـەیی باڵدار رازاندووەتەوە کە لە نێو بازنەکەدا وێنەی کەسێکیان کێشاوە، جل و بـەرگی پاشایی بەشێوەی مادی یا موبەدی لەبەر بووەو پێـی گوتراوە فروهـەر.. لـە وڵاتی ئاشوردا، تەنیا بازنەیەکی باڵدار هـەبووە، رەمـزی خواوەنـدی گـەورەی ئاشـوور بـووەو بـە نـاوی ئاشـور بـووە کـە لـە زەمـانی داریوویـشی مەزنـدا وەرگـیراوەو کەسـێکیان بـە جلـی مـادەوە لـە ناوەڕاسـتیا دانـاوەو بـووە بـە فروهەری ئێران".

بەشێك لە تیرەی کورمانج، لە لەشکرکێشییەکانی پاشـتردا چوونەتە پێـشترو دەگـەڵ خێڵـی کاردویـای کـۆن و ئاراراتیەکانـدا تێکـەڵ بوونـە، و چـونکە هەموویان لە یەك رەچەڵەك و نەژاد بوونە، تەواو ئاوێتەی یەکدی بـوون و ئیدی هەموویان لە ژێر ناوی هاوبەشی خۆیانا، کاردو- کوردا کۆبوونەتـەوە. نووسین و بەرهەمی مێژوونووسانی ئەرمـەنیش ئەمـە دەسـەلمێنن و دەڵـێن: "هێرشـبەرانی (کـوردو) هـەر زوو خـەڵکی (کرچـیخ) یـان لـە نێـو خـۆدا تواندەوە".

(سلف ریـچ)ی نـەژادناس لـە رووی جۆری ژیانـەوە کوردەکانی بـە دوو تـیرە ژمـاردووە، تیرەیـەکیان چادرنـشین و مـەڕدارو تفەنگـچین و نـاوی نـاون (ئاسـیرتا). تیرەکـەی تریـان گوندنـشین و جوتیـارن و نـاوی نـاون گـۆران) بڕوانە: کتێبی کوردو پیویستگی نژادی و تاریخی او).

لـە بەشـی کوردسـتانی (رەزاییـە و شـاهپور)شـدا ئەوانـەی کـە پێکهاتـەی عەشـایەریان هەیـە بـەخۆ دەڵـێن: (کـورد) و ئەوانـەی خـەریکی کـشتوکاڵن

دەڵێن (کرمانج) ئەم کرمانجانەش خۆ بە کورد دەزانن. هەروەها ئەم عەشایەرانەش خۆیان بە کرمانج و بەمیللەتی کورد دەزانن. نە لە زمان و نە لە داب و نەریتدا هیچ جیاوازییەکیان نییە.

دیارە (سلف ریج) مەبەستی (سیرتی cyrti، کورتیەکان) بووەو بە (ئاسیرتا) حاڵی بووە، لەگەڵ ئەمەشدا لەوەیە هەر عەشایەری کورتیەکان بووبن کە دەسەڵاتیان بەسەر هەموو ناوچە کوردنشینەکاندا پەیدا کردبێ و لەگەڵ تیرەکانی (ماد، گوتی)دا تێکەڵ بووبن و بە نێوی خێڵەکیانەی ئەوانەوە، واتە کرمانج و گۆران ناویان بڵاوبووبێتەوە. لە کوردستانی تورکیاشدا ئەوانەی عەشایەر نەبوونەو نیشتەجێی شارو شارۆچکەکان بوونە تا پێش (٢٠٠- ٢٥٠) ساڵێك لە ناوچەکانی خۆیان بەشێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ حوکمڕانیان دەکرد، وەك حوکمڕانانی هەکاری، حوکمڕانانی ئامێدی، حوکمڕانانی جزیرە، میرانی فینك، حوکمڕانانی حسکیف، حوکمڕانانی چمشکزك، میرانی مجنکرد، حوکمڕانانی پرتك، حوکمڕانانی سقمان، حوکمڕانانی مرداسی، حوکمڕانانی ئەکیل، حوکمڕانانی پالو، میرانی چرموك، حوکمڕانانی خیران، میرانی شیروان،میرانی تەرگوەر، میرانی محمودی، میرانی دنبلی، حوکمڕانانی تبلیس، میرانی موش، مەلازگرد، وان.... هتد. پاشان عەشایەرەکان قوەتیان پەیدا کردووەو هەندێ لەو حوکمڕانانەیان لە هەندێ جێدا کردووەو بە رەعیەتی خۆیان!.

ماڵباتی حوکمڕانەکان، لەقەبی (بەگ)یشیان هەلگرتووەو پایەو شکۆی خۆیان پاراستووە.

ناوی ناوچەی (ماد) لە سەردەمی ساسانییەکاندا بوو بە (مای) و لە سەردەمی عەرەبەکانا بوو بە (ماه) پاش ماوەیەکی زۆر کە دانیشتوانی ئەو

ناوچانە ناو دەنرێن کورد، لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا ئەم ناوچەیە ناوی کوردستانی گرتەخۆ، (کرماشان و هەمەدان و لورستان)ش لە چوار چێوەی کوردستاندا بوونە. مەرکەزو مەڵبەندی کوردستان، شاری (بەهار)ی نزیکی هەمەدان بووە کە تا ئەمڕۆش شوێنەواری ئەم شارە هەر ماوە. لە سەردەمی سەفەوییەکاندا بۆ ئەوەی کاروباری کوردستان بە ئاسانی بەڕێوە ببرێ، هەمەدان و لورستانیان لێ جیا کردەوە.

مێژوو، (کوسی و مادەکان) بە خودان پەزی زۆر و شوانکارەیی وەسف دەکات. ئاوێستاش جەمشید و فەرەیدوونی وەکو خودان مێگەلی فرە ناساندوون. مێژوو دەنووسێت کە لە نێو مادەکاندا خێزان و جڵەوی خێزان بەدەست باوك بووە. ژنی زۆریان دەهێنا، بە جیاو دوور لە یەکدی دەژیان، لە کاتی مەترسیدا یەکیان دەگرتەوە، هەروەها مێژووەکان، سەبارەت بە کۆسیەکانی (ئەنزان)ش دەڵێن خەڵکانێکی جوداخواز بوونەو رامکردنیان یەجگار دژوارو سەخت بووە، بەسەر شارانی دژمنیاندا دەدا، تالانیان دەکردو پاشان دەگەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان، بۆیە ج سوودێکیان لەو شەڕانە نەدەبینی، لە راستیدا پاشینانی چەند هەزار ساڵەیان، کوردەکانی ئەمڕۆش کە نەوەی چەند هەزار ساڵەی ئەوانن، هەمان خوو خەسڵەتی باپیرانی خۆیان پاراستووە.

کورد، بە شێوەیەکی گشتی بریتیین لە چوار هۆزو تایفەی گەورە:

١- لورو بەختیاری

٢- کولهور

٣- گۆران

٤- کرمانج.

بەختیاریەکان هەوەڵجار لەگەڵ لوڕی گەورەدا بوونە، پاشان بە بەختیاری ناسراون. مێژووی بەختیاری/ نووسینی سەردار ئەسعەد بەختیاری دەڵێت: "ئەو تیرانەی کە لە چیای (سماق)ی شامەوە هاتوون هەندێکیان لە بەختیاریدا و جەماعەتێکیان لە (کێوی گیلویە)دا گیرسانەوە، ژمارەیەکیان بە درێژایی رۆژگار لە نێو چوونە، تیرەکیان نێوی بەختیاری بووە، وەکو چۆن ئەمڕۆکەش تیرەیەك لەوانە بە نێوی (بەختیار وەند) ماوە.
(لورد کورزون) لە گەشتنامەکەی خۆیدا دەنووسێت ئایا لوڕەکان تورکن یا ئێرانین یا (اسمیت)ن. هەموو ئەو مێژوونووسانەی کە باسی لوڕیان کردووە ئاماژەیان بۆ ئەو سێ نەژادەی سەرێ کردووە. بەڵام بە رواڵەتا لەوە دەچێت لەو تیرە کوردانەی باکوربن. بەڵام زمانی ئەوان لە زمانی فارسی دەچێت، وێڕای ئەمەش زمانەکەیان جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ زمانی کوردیدا نیە.
(ریچ) لە گەشتەکەی کوردستانیا، بەختیاریەکانی بەکورد داناون. بەختیاریەکان بە کوردەکان دەڵێن (لەك) کە هۆزێکە لە لوڕا....

* * *

ئەو سووکە جیاوازییەی ئەمڕۆ لە نێوان شێوەزارەکانی کوردیدا هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پاش ئیسلام، وێڕای نەبوونی خوێندەواری بە کوردی، کە خۆی لە خۆیدا پارێزەری یەکێتیی شێوەزارەکانی زمانە، زمانی داگیرکەرانیش لە نێو کوردستانی پان و بەرینا بڵاو بووەتەوەو ئیدی میللەتی کورد لەبەر نا تەبایی و ناکۆکی و دووبەرەکی خۆی، بە دەستی میللەتانی دی دابەش بووە.

لە سەردەمی ساسانیەکاندا، زمانی رەسمی دەوڵەت، زمانی پەهلەوی بووە کە زۆر لە کوردییەوە نزیك بووەو تەنانەت دەشێت بگوترێ زمانی کوردی ئەو سەردەمە بووە (سەردار ناسری رەحمەتی سەر خێڵی سەنجابی دەیگوت: "من لای عبدالله خان قوچ می دینم السلگان کلهور، نووسراوێکم دیتوە کە شەهربانو خاتوون، کیژی یەزدگور گورد بۆ بابی نووسی بوو و لەو نووسینەدا دەیگوت: (بابۆ بە خۆڕایی نامەی پێغەمبەرت دڕی) کە هەر هەمووی کوردی بوو" پاش ئیسلام سەلاحەدینی ئەیوبی، پاشای مەزنی کورد کە مایەی شانازی جیهانی ئیسلامەو ناوبانگی جیهانی هەیە، بووە بە سوڵتانی میسرو گەورەی زەندیانی، شاهنشایی ئێران. یەکەمیانی بەنێوی عەرەب و دووەمیانی بەنێوی فارسەوە حوکمڕانی کردووە. ئیدی بەپێی پێداویستییەکانی سەردەمی خۆیان کە باوەڕی ئاینی بەسەر هەستی نەتەوەییدا زاڵ بووە، ئەیوبییەکان بایەخیان بە چاککردن و بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی خۆ واتە، زمانی کۆنی ئێران نەداوە.

حکومەتە (کوردیە) چکۆڵەکانی دیش کەمتەرخەمییان دەرهەق بە زمانی نەتەوەیی خۆ کردووە. شاعیران و نووسەرانی کورد بە زمانی عەرەبی و تورکی شیعریان گوتووەو کتێبیان نووسیوە.

هەر چەندە ئازەربایجانیش موڵکی ماد بووەو دانیشتوانەکەی ماد بوونە، بەڵام چونکە ناوچەی نێوبراو ناوی (ئاتورپاتکان)ی گرتبووەخۆ، ئیدی کوردستانی پێ نەگوتراوە. دەنا دانیشتوانەکەی هەر لە کۆنەوە کورد بوون و لەلایەن پاشایانی کوردەوە، رەوادی، شەدادیو... هتد بەڕێوەبراوە. ئێستاش خوێنی (عادی) لە دەمارەکانیاندایەو لەگەڵ کوردا هاو نەژادن. چونکە ساڵانێکی دوورو درێژ لە ژێر رکێفو دەسەڵاتی تورکەکاندا بوونە، ئیدی

زمانی زگماکی خۆیان فەرامۆش کردووەو تورکی فێر بوون و لەبەر ئەمە بەشێکی زۆریان وا خەیاڵ دەکەن کە لە نەژادی تورکن. تەنانەت ئەوانەشیان کە تا ئەمڕۆش ناوی تایفەی (کورد)یان ماوە، وەك: دونبلییەکانی خوی، گۆرانەکانی رەزاییە، قەرەچولیەکانی ئەرس باران، خۆیان بە تورك دەزانن، تەنیا قەرچولیەکان دان بەوەدا دەنەن کە باب و باپیرانیان (کورد) بوونە. (رودهن)ش وەکو خەڵکی قەرەچولیەکان بە تورکی قسە دەکەن و دەڵێن باو باپیرانمان کورد بوونەو بەکوردی قسەیان دەکرد. یەکەم تایفەی تورك کە گەییە ئازەربایجان بەر لە ساڵی (٤١٠ی کۆچی) بوو. کە پاشای ئازەربایجان، و هسودان بۆ ئەوەی لە شەڕا سوودیان لێ وەربگرێت هێنانیە ئازەربایجان.. مێژوونووسان، رای جیاوازیان لەمەڕ ژمارەی ئەم تایفەیە هەیە. هەندێکیان بە دوو هەزار پیاویان دەقەبلێنن و هەندێکی دی بە دوو هەزار چادریان (واتە ماڵ- وەرگێر) لە قەڵەم دەدەن. چونکە ئەم تایفە درو شەڕکەرانە (غزەکان) ئازاریان بە دراوسێکانی خۆیان دەگەیاند بۆیە (میروهسودان لەگەڵ ئەبولهەیجای کوڕی ربیب الدولە کە پێشەوای کوردەکانی هەزبانی بوو، هەروەها خوشکەزای امیر وهسودان بوو. رێك کەوت و ئەوانەیان لە ئازەربایجان دەرکرد.

بەشێکیان کە لە رەزاییە بوونە، روویان کردە ناوچەکانی هەکاری، کوردەکان پێشیان لێگرتن، لە یەکەم شەڕا کوردەکان شکان و پەنایان بردە بەر کێوەکان، بەڵام پاشان گەڕانەوەو (غزەکانیان) شکاندو هەزار پیاویان لێکوشتن و تاقمێکیان لێگرتن کە حەوتیان میرو سەد کەسیان گەورە پیاو بوون.. پێش سەڵتەنەتو دەسەڵاتدارێتی رەوادی و شەدادیە کوردەکان لە ئازەربایجان، لە سەدەی شەشەمی میلادی دا ئازەربایجان بەشێك بووە لە

حکومەتی سەربەخۆی کوردکو ئاتانزی گوران، کە مەرکەزی ئەم حکومەتە کرماشان بووە. گۆرانەکانی رەزاییە کە خۆیان بە تورك دەزانن، پاشماوەی ئەو گۆرانانەن... لە ساڵی (٣٠٩ کۆچی) (صدقە بن علی) کە لە کوردەکانی موسڵ بووە لە رەزاییەدا حوکمڕانی دەکردو لەلایەن خەلیفە مامونەوە کراوە بە والی ئەرمەنستان و ئازەربایجان و لەگەڵ (بابەکی خورەمی)دا شەڕی کردووە.. (مر بن علی) موسڵی تائی کوردیش هاتووەتە گوندی (نەزیر) و لەوێندەر نیشتەجێ بوو و کردی بە شارو بوو بە فەرمانڕەوای ئەو ناوچانە. لە ساڵی (٣٦٠ کۆچی)دا نەوەی (مر عمر) لە لایەن خەلیفەوە کرا بە والی ئازەربایجان. بە گوتەی ئەستەخریی گەڕیدە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا ئازەربایجان بە دەستی عەشایەری (ردێنی)یەوە بووە، پایتەختی حکومەتەکە یەکەمجار (مەراغە) بووەو پاشان گوێزراوەتەوە بۆ ئەردەبیل...
ئەگەرچی ئەمڕۆ، نێوی کوردو کوردستان لە نێو هەموو خەڵك و ناوچە مادنشینەکاندا نابینین، بەڵام ئەگەر لە مێژووی سەردەمی ساسانییەکان و سەرەتاکانی ئیسلام ورد ببینەوە ئەوا ناوی میللەتی کورد لە هەموو ناوچەکانی مادا، تەنانەت لە مازندەران، خوراسان، کرمان، ئەفغان، بوخارا، بلوجستان، ئاران، ئەرمەنستان، کارداکیەو تا سیواس و ئەسکەندەروون دەبینین.. بۆ زانیاری زیاتر لە مبارەیەوە بڕوانە کتێبی: (کردو پیویستگی نژادی و تاریخی او، تاریخی کوردو کوردستان) کە روونکردنەوەو شرۆڤەی تێرو تەسەل و بە سوودیان تێدایە.
(مویر) کۆمەڵێك سەرنجی لەمەڕ (جەژنی کوردی) دەماوەندییەکان خستووەتە روو، ئەم ناوە ئەوە دەسەلمێنێ کە خەڵکی دەوروبەری دەماوەند کە بە گوتەی ئاشوریەکان بە مادی دوورە دەست دەژمێردران، (کورد)

بوونە. بۆ نموونە وشەی (مازندەران) بۆ خۆی وشەیەکی کوردیە (مازن تر، مازن تران) لە (مەزن)ەوە هاتووە کە لە کوریدا مەعنای گەورە دەگەیەنێ، واتە گەورەتران!.

لە سەردەمی حوکمڕانی موعتەسەمدا کە ئەم ناوچەیە بە تەواوی لەلایەن عەرەبەکانەوە گیرا، ناوی پاشای ئەم ناچەیە (مازیار) بوو کە ئەم ناوەش وشەیەکی کوردیەو بە مانای (دۆستی گەورە)یە. مازیار لەلایەن عەرەبەکانەوە یەخسیر کراو لە (سامەڕا)ی پایتەختی موعتەسەمدا لە سێدارەیاندا، مازندەرانیش کەوتە دەستی (عبدالله بن گاهر).

چونکە لە سەرەتاکانی ئیسلامدا دەسەڵات بە دەستی عەرەبەکان بووەو کورد تاقە میللەتێك بووە کە بە توندی بە گژیاندا چووەتەوە، بۆیە سوپای عەرەب ئەوەندەی بەس بووە کە هەر خێڵێك یا شارێك سەر بە کورد بووبێ، تا قەتڵ و عام و تالانی بکات.

کتێبی: (کوردو پیوستگی نژادی و تاریخی او) دەڵێت: "مەرزەوانی ئازەربایجان گیرۆدەی هێرشی عەرەبەکان بوو و چونکە نەیتوانی بەرەنگاری بکات، پارەیەکی زۆری دا بەو مەرجەی عارەب دەستبەرداری کوشتن و تالانکردنی کوردەکان ببێ". لەبەر ئەمە: ئەو خەڵکانەی کە شارنشین بوونەو گوزەرانی خۆیان لە ڕێگەی کارو کاسبییەوە دابینکردووە یا ئەو دێهاتیانەی بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون، لە ترسی ماڵ و گیانی خۆیان لە کورد دوور کەوتوونەتەوە، تەنیا هۆزو تیرە مەڕدارو چەکدارەکان کە لە شەڕو شۆڕی یەك لە دوای یەکدا قاڵ بوو بوون، شانازیان بە (کوردبوونی) خۆوە کردووەو نێوی کوردیان پاراستووە. دیارە ئەمانە لە ژێر گوشاری حکومەتانی وەختدا پتر لە دنیای عیلم و زانست دوور کەوتوونەتەوە.

دژمنەکانیان، کەوتوونەتە بانگەشەی غەرەزدار دژیان و کوردیان بە هاوتای دزو ڕێگرو چەتە لە قەڵەم داوە. بەمجۆرە ئارەزووی خوێنەواری و زانست و دۆستیان لای خەڵکانی ئەم میللەتە کوشتووەو تەفرەقەیان خستووەتە ناویان، تەنیا (کارداکیا)ی پاشماوەی هالدی –ئاراراتییەکان- میتانی، دانیشتوانی کۆسارەکانی زاگرۆس و ئەنزان نەبێ کە لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا باری قورسی پاراستنی ئارایاییەکانیان و زیاد کردن و پاراستنی شان و شەوکەتی شاهنشایان لەسەر شان بووەو ئەم ئەرکە قورس و پڕ شانازییەیان بەوپەڕی گیانبازییەوە ئەنجام داوە، لە پاداشتی ئەم لێوەشاوەییەدا سیفەتی (قارەمانی و پاڵەوانی)ی کوردیان سەلاندووە و کونیان لە جەرگ نەبووەو لە شەڕو شۆڕە یەك لە دوای یەکەکاندا، هونەری ئازایەتی و عەگیدی و ڕەشیدییان نواندووەو بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار شوێنەکەشیان ناونراوە کوردستان.

ئەولیا چەلەبی، گەڕیدەی ناوداری تورك لە ساڵی (١٠٥٦)ی کۆچیدا، لە سیاحەتنامەکەی خۆیدا دەڵێت: سنووری کوردستان لە باکوورەوە ئەرزرۆمەو لە باشوورەوە بەسرە –کەنداوی فارسە. مێژووی ڕۆژهەڵاتی کۆن دەڵێت: "مەنزڵ و شوێنی میللەتی کورد لە کەنداوی فارسەوە تا دەریای خەزەرە. کتێبی (کورد عشیرتلری) کە لەلایەن بەڕێوەبەرێتی گشتی عەشایەرو کۆچەریانەوە دەربارەی کوردەکانی عوسمانی، لە ئەستەموڵ بڵاوبووەتەوەو لە ساڵی (١٩١٨ز) لە چاپخانەی نورخانیە چاپ بووە، دەڵێت: "ناوچەی سنووری عەشایەری کورد لە باشوورەوە عێراق و موسڵە، لە باکوورەوە لازستانە، لە ڕۆژاواوە مەرکەزی ئەنادۆڵەو لە ڕۆژهەڵاتەوە

عەجەمستانو کۆسارەکانی ئاراراتە". ئەم ناوچەیە تەنیا کوردستانی تورکیا دەگرێتەوە کە تورکەکان بە خۆیشیان ئیعتراف پێدەکەن.

ئەو تیرە کوردانەی کە لە کۆندا لە ناوچەی فارس دەژیان (کورتی، مرد، ئەمرددەکان) بوونە کە (سترابون)ش ئاماژەی بۆ بوونیان لەو ناوچەیە کردووە. هیرودوت ناوی تیرەیەکی (پارس)ی بە (مرۆڤی) بردووە. چونکە (مرۆڤ) وشەیەکی کوردیەو مانای ئادەمیزاد دەگەیەنێ بۆیە دوور نییە ئەو تیرەیەش کورد بووبن.

لە سەرەتای سەدەی سێیەمی زاینیدا شاری (ئەستەخر) کە زەمانێک پایتەختی پاشای ئێران بووە، پاشاکەی ناوی (کوچیهر) بووەو لە نەوەی (بازرەنگی) یانی کورد بووە. ئەم بنەماڵەیە لە سەدەی یەکەمی زاینیدا هەبووەو لەو شوێنەدا جێی هەخامەنشیەکانی گرتبووەوە.

ڕەشید یاسمی ڕەحمەتی لە باسی نەژادی ساسانییەکان پاش زنجیرە ڕوونکردنەوەیەك، گەییوەتە ئەم ئەنجامگیریەی کە باپیری (ئەردەشیر بابك) یانی ساسان لە تایفەی شوانکارەی کوردەو دایکی (بابك) کیژی تایفەیەکی کوردی بازرەنگییە. شوێنی نەشونمای ئەم بنەماڵەیە ناوچەی کوردنشینی فارسە، نێوبراو بۆ پشتیوانی قسەکەی خۆی دەڵێت: "ئەردەوانی پێنجەمی ئەشکانی لەو نامەیەدا کە لەبەردەم خەڵکیدا خوێندراوەتەوە چەند دەستەواژەیەکی نووسیوە کە لای تەبەری و ابن ئەپیردا تۆمار کراوەو تەرجەمەکەی ئەمەیە: "- تۆ پێت لە بەڕەی خۆت زیاتر ڕاکێشاوەو بەرەو پیری مەرگی خۆت چوویت، ئەی کورد نەژاد کە لە خێوەتی کوردانا پەروەردە بووی، کێ ڕێی داوی ئەم تاجە لەسەر بنەیت".

هەخامەنشیەکان کە لە تایفەی (پاسارکارد) بوونەو لە شاری (ئەستەخر)دا سەلتەنەتیان هەبووە، پاشان کوردەکان هاتوونەتە شوێنیان و پاشایەتی (ئەستەخر)یان گرتووەتە دەست و شوێنی هەخامەنشیەکانیان گرتووەتەوە.
لێرەدا ئامەوێ بڵێم کە (پاسارکادی)یەکانیش تیرەیەکی کورد بوونە، بەڵام ئاوە وەبیران ئەخەمەوە کە ئایا ئاشێت تیرەکانی (شوانان و بازرەنگی) لە پاسارکادەکان بووبن، بەو پێیە کە وشەی (پاسارکاد) بەتێپەڕبوونی رۆژگار بووە بە پاسارگار، ساپاکار، ساپانکار، شبانکار، شبانکاردو پاشان کوردبوونیان ئاشکرا بووە.
ساسان لە ماڵباتی نەجیبزادەو موبەدی پەرستگەی (ئاناهیتا)ی شاری (ئەستەخر) بووە کە دانیشتوانی ئەو شوێنە (پاسارکاد)ی بوونەو بێگومان دەبێ هەر ئەم پاسارکاردییانە بووبن کە پاشان بە (شوانکارە) ناسراون.
هەندێ سەرچاوەی مێژوویی دەڵێن: ئاکمەند، ئاخەمنش، لە رەچەڵەکی هوخشترەی پاشای ماد بووەو (ئاخەمنش) پاشای ئەنزان بوو. (شیلهاك ئینشو شیناك) کە کۆتایی بە پاشایەتی کۆسییەکان هێنا، (ئەنزان)شی داگیر کرد.
(فرورتیش)ی پاشای ماد، لە ساڵی (٦٥٠پ.ز) ئەنزانی وەرگرتووەتەوەو کۆسیەکانی هاونەژادی خۆی رزگار کردوون.
دوای پاشای کوسی کە بەدەستی (ئینشو شیناك) لە نێو چوو، نێوی (ئانلیل نادین- ئاخە) بوو، زۆر لەگینە وشەی ئاخەمنش بەڵگەی ئەمە بێ کە لە نەژادی ئاخە بووە. چونکە کوسیەکان ئەژدادی کوردەکان بوونە، بۆیە دوور نییە شوانکارەش (پاسارکاد) بووبێ، کتێبی (ایران نامه یا کارنامه ایرانیان در عصر اشکانیان) لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمدا لە باسی (کردستان یا

سویــچره ایــران)دا دەربــارەی کوردەکــان بۆچــوونی ڕۆژهــەڵاتناس و مێژوونووســەکان دووپــات دەکاتــەوەو دەڵێــت: "ئەوانــە بــە یــەکێك لــە ئابڕومەنــدترین و کــۆنترین ئاریــایی ئێــران دەژمێــردرێن و لەوەیــە ئــەو ئارییانــەی لــە ساڵی (١٨٠٠ پ.ز) لــە بابلدا حوکمڕانیان کــردووەو یاساوان و فەیلەسوفیان تیــا هەڵکەوتووەو لــە مێــژوودا بــە کاســۆ یــا کاسیت ناویــان دەرکــردووە، بــاب و بــاپیری کوردەکــانی ئــەمڕۆ بــن کــە ئاشــوریەکان لــە بــەردەنوس و کەتیبــەکانی خۆیانــا بــە (کورتیــك، کــورد، کــورتی) نێویــان بردوون...".

(ئــەنزان)ی نیــشتمانی هەخامــەنش، شــوێنی ئــەم کاسیتانە بــووە، کەتیبــەی مــالامیر بــەختیاری کــە بــۆ ســاڵانی (١٣٠٠- ١٢٠٠ پ.ز) دەگەڕێتــەوە، ئــەوە نیشاندەدا کە ماوەیــەکی کــەم بــەر لــە نــەمانی دەوڵــەتی کوسی، تایفەیــەکی کورد، ئەمرەدییەکانی کوتی لە ناوچــەی ئــەنزان بوونــەو حکومــەتی خۆیــان هەبووە، لەو بەردەنووسەدا (کەتیبە) دەڵێت: "من تخی خی گوتو ئامــاردی پاشــا، کــوڕی خــنی، ئــەم خــەت و نەخــشانەم لــەم کێــوەدا تــەواو کــرد، مــن پەیڕەوی خوای تایفەی نرسی و دیتبی Ditbi و تەرتــەر و خــوای گــەورەو شوێنی ئەم خەتانە لە کێودا و خەتــەکانی خــوای (مــان) و خــوای (خــوی) و وێنەی ئەم پاشایەی کە ئەم شوێنەی دروست کردووەو یارمــەتیی مــنی داوە، من وێنەکانی خوای تەرتەرم کە پارێزەری ئەم تیرەیەیە کۆم کردوونەوە".

* * *

شورەیەکی قایم دروستکرد، ناوی پاشاکەیان کە نێوی (ئینــدکری Indikiri کوڕی سترکیت Suturkit) بوو لەسەر هەڵکەندبوو، هەموو ناوو دیوارەکانم وەقفی ئەوان کرد. شارەکەیانم کــە (خــدی) بــوو ئــاوەدان کــردەوە، هــەروەها

پەیکەری (دیتبی)م کە خوایەکی گەورەیەو خاکی ئەم ئەنزانەی پێ بەخشیوم ساز کردەوە. جادەیەکیشم دروستکرد کە لە ئەمرەدییەوە رەت دەبێ، پاشایانی ناوچەی چۆمی (بەرن)م کۆکردنەوە، پاساو پەیکەری دیتبی مەزن کە وڵاتی ئەنزانی بەمن بەخشی و خواکانی تری ئەمرەدیان کە یارمەتیان دام بەم کارەی من خۆشحاڵ بوون. وڵاتی (ساە سیکشی)م داگیرکرد، رێگای ئەمرەدیشم دروستکرد". تەرجومەی ئەم خەتە بزمارییە سایسی پرۆفیسۆری ئەندامی کۆنگرەی رۆژهەڵاتی لیدکە لە هۆڵەندا کردوویەتی. ئەم پاشایە، واتە (تخی خی کوتو ئەماردی) بەردەنووسێکی تری لە ئەشکەوتی سلێماندا لە پاش بەجێماوە، لەو بەردەنووسەدا دەڵێت:

"من تخی خی ئاماردی پاشا کوڕی خنی، خەڵکیم راسپارد پێش نوێژم بۆ خوایانی ئەمرەدی هەڵکەند، ئەم وێنەیە (بم بتی)یەم تاشی، بەڵام خوای (مان)م لێرەدا هەڵنەکەند، لە شوێنێکی شاراوەدا دروستم کردووە". بڕوانە: (تاریخ بختیاری).

ئەماردی یا ئەمرەدی، تیرەیەکی کوردە کەسترابون لەگەڵ کورتیەکانی ناوچە جیاوازەکانی ئێراندا ناوی هێناوەو بەهاونەژادی لە قەڵەم داون. ئەم بەردەنووسانە لە راستیا زۆر گیرو گرفتیان چارەسەر کردووە، جگە لەوەی یەکێتیی (کوتو و کوسو) نیشاندەدەن، ئەوەش دەسەلمێنن کە تیرەی ئەماردی لە کوتوکان بوونەو کوتوکانیش، کورتی بوونە.

سنووری کورتیەکان تا سەدەی بیست و شەشەمی پ.ز لە عیلامەوە تا ئاتنە بوو، بۆ ماوەی سەدو بیست و پێنج ساڵیش عیلامیان لە ژێر دەست دا بووە. لە ئەنزانشدا گوتیەکان نیشتەجێ بوونە. پاشان کوسیەکان لە ئەنزاندا پەیدا بوون و کاسیتەکان لە باکووردوە هاتن و لە ئەنزانەوە جمان و

هەڵیانکوتایە سەر بابل و نزیکەی حەوت سەد ساڵ حوکمیان کردووەو پاشان گەڕاونەتەوە بۆ کۆچارەکانی خۆیان.

کەتیبەی مالامیر لەو سەردەمدا نووسراوەو ئەوە دەردەخات کە ئەو هۆزەی لە ئەنزاندا حوکمی کردووە تیرەیەك بووە لە گوتوکان و (ئەمرەدی) پێگوتراوە، چونکە ئەنزان نیشتمانی کوسی، کاسیتەکان بووە، دەبێ (ئەمرەدی) تیرەیەك بووبن لە کاسیتەکان و کاسیتەکانیش لە گوتیەکان بوونە.

ئەم بەردەنووسە (کەتیبە) نێوی پاشاکەی بە (ئیندیکری کوڕی سوترکیت) تۆمار کردووە، کە نێوی تایفەیەکی (ماد)ش (ئەستوگرت، ئەستروخات) بووە.

کتێبی "کردو پیوستگی نژادی و تاریخی او" دەڵێت: "تایفەی ئەمرەد یان مارد لە دۆستان و یارانی کوروشی گەورە بووەو ئەو تایفەیە بە ئەژدادی کوردو لوڕەکان دەزانن کە بەشێکیان لە فارس دا نیشتەجێ بوونەو هەن".

بە گوێرەی بەردەنووسەکەی مالامیر بێ، دەشێت بگوترێ کە کوروش لەوانەوە نزیك بووە.

سترابون لە زمانی (ئاراتستن)ەوە دەڵێت لە فارس دا هەندێ تیرەی وەکو کورد، مەرد، مەجوس و .... هتد نیشتەجێنە.

بەردەنووسەکانی ئاشور بەناوچەکانی ڕۆژاوای دەریاچەی ڕەزاییەیان گوتووە (پارپوا) ئەمانە تیرەی (پارپ، پارت)ن کە لە شوێنەکانی خۆیانەوە کوچیان کردووەو بەرەو باشووری دەریای خەزەر چوونە. داریوشی مەزن پێی گوتوون (پرپو) فەرەنسیەکان (پارتیك) یان پێدەڵێن.

(ئاسەرهەدون)ی پاشای ئاشور ئەم تیرەیەی بە ماد زانیوە. بە پێی ئەو نووسراوانەی کە لەسەر خشت دۆزراونەتەوە، لە سەردەمی (سەنحاریب)دا تیرەیەك بە نێوی (پرسواس) کە دەڵێن (پارس)ـە لە شاوری عیلامدا نیشتەجێ بووە. (سلم نصر) لە سەرکەوتنەکەی خۆیدا ئاماژە بۆ نەفەرێکی ئەرتەشە دەکا کە لە نزیکی تیرەی (پرسواس) نیشتەجێ بووە. ئاشوریەکان لە سەرچاوەیەکیاندا شوێنی (پرسواس)یان بە رۆژاوای عیلام داناوەو هەر لە هەمان سەرچاوەدا رۆژاواو باشوری رۆژاوا بە شوێنی (ئامادی و پارسواکان) لە قەڵەم دەدەن. بەمەدا دەردەکەوێ کە پارسواکان، (پرسواس)کان نەبوونە. ئەمە جگە لەوەی هوخشترەی پاشای ماد لە باشووری پارسدا (پارسومیش)ی گرتووەو لە باکووردا (پارسواکانی) لە دەستی ئاشووریەکان دەکردووە. بەبۆچوونی نووسەر ناشێت (پارسواکانی) باکور لەگەڵ (پارسومیش یا پرسواس)ەکانی باشووردا بە یەك بزانرێن. هەر بۆ پشتیوانی ئەم بۆچوونەش (سیرجان ملکم) نووسەری ئینگلیز لە مێژووەکەی خۆیدا دەڵێت: "هەندێ لێکۆڵەرەوە ڕایان وایە کە سوڵتانەکانی (پارپیا) لە بنەڕەتدا تۆران یا تاتارن و چەند سەدەیەك دەسەلاتیان بەسەر ئێران دا هەبووە، بەڵام زۆر بەڵگەی پێچەوانەی ئەم رایەش هەن. یەکێك لە لێکۆڵەرەوەو مێژوونووسانی کۆن دەڵێت کە خەڵکی پارپیا لە کەنارەکانی دیجلەدا نیشتەجێ بوونەو لە کۆندا ناویان (کاردوش) بووە. هەڵکەوتەی خاکی (کاردوشیەکان) کوردستانی ئەمڕۆیە. هەمان نووسەر لە خوارترەوە دەڵێت: "لە مردنی ئەسکەندەرەوە تا ئەردەشیر بابك نزیکەی پێنج سەد ساڵ دەبێت، ئەم ماوە دوورو درێژە لە مێژووی رۆژهەڵاتدا ون و نادیارە.

فیردەوسی تەنیا ئەوەندە دەڵێت کە گوایە هیچ مێژوویەکی ئەو ماوەیە نەماوەو دەڵێت: "پاش مردنی ئەسکەندەر وڵاتی گەورەی ئێران نزیکەی دوو سەد ساڵێك لە پاشاگەردانی دا بووەو دەرمبەگ و سەرۆك عەشایەر بەڕێوەیان بردووەو هەمیشە لە نێو خۆیاندا لە شەڕدا بوون، شیرازەی وڵات بە جۆرێ پچڕاوە کەس بە کەس نەبووە، دەشێت بگوترێ ئێران لە هەموو ئەو ماوەیەدا وڵاتی بێ حاکم و میللەتی بێ خاوەن بووە!... بە هەر حاڵ فیردەوسی مێژووی ئەو سەردەمەی بە تەواوی فەرامۆش کردووە، کەچی مێژووی رومیەکان پڕە لە ڕووداوی ئەوتۆ کە ئێرانییەکان دکارن شانازی پێوە بکەن. پاشایانی (پرپیا) کە ئەمڕۆ ناویان لە مێژووی ئێراندا ونە، پاشای ئەوتۆ بوونە کە شمشێری هەمیشە بریقەداری ڕۆمیەکان نەیاندەتوانی ڕووبەڕوویان بوەستنەوە. دەتوانرێ بگوترێ سەرچاوەی ئەو هونەرو ئازایەتیە ئێرانییەکان بوونە. بە هەر حاڵ دانیشتوانی ئەو وڵاتەی کە بەسەر ڕۆمیەکاندا سەر دەکەوتن، لە نزیکی مەملەکەتەکانی روم بوونە و لە دەریای خەزەرەوە تا کەنداوی فارس درێژەی هەبووە، بریتی بووە لە کۆساری سەخت، دۆڵی ترسناك، روباری خۆڕ و دەشتی قاقڕو کاکی بە کاکی. ڕۆمیەکان نەیان توانی بوو ئەو تایفە ملکەچ و گوێڕایەڵی خۆ بکەن. کارامەترین و ئازاترین دلاوەرانی ڕۆم کە لە سەردارەکانی خۆیانەوە باسی شەڕی (پرپیا)یان دەژنەوت سەری خۆیان دادەخست.

ئەم ناوچانەی (سیرجان ملکم) ئاماژەیان بۆ دەکا نیشتمانی مادی کۆن و کوردی دوای ئەوان دەگرێتەوە. ئەمەش بەڵگەیەکی گەشی گیانبازی و فیداکاری کوردانە لە ڕای پاراستنی خۆیان و ئێرانیەکان. هەروەها بەڵگەی ئەوەشە کە کورد چەقی قورسایی ئێرانی پێکهێناوەو ئەو تیرەو هۆزانەی کە

بە نێوی ئێران و ئێرانیەوە هەمیشە لەگەڵ ڕۆمیەکاندا لە شەڕدا بوون، بە گوێرەی هەڵکەوتی جوگرافیاییاندا دەردەکەوێ تەنیا کوردەکان بوونە.

لێرەدا قسەیەکی پرۆفیسۆر هرتسفلدم دێتەوە یاد کە گوتویەتی: "ئەگەر تاقە ناوێك شایانی دانیشتوانی ئێرانی بەر لە ئاریەکان بێ، دەبێ وشەی (کاسپین) بێ و ئێمە دەتوانین ریشەی ئەم وشەیە لە زۆر شوێنی ئێراندا بدۆزینەوە... جا هەر بەو پێودانگە ئەگەر پاش ساسانیەکان بۆ ناوێك بگەڕێین کە پڕ بە پێست و شایان و لایەقی دانیشتوانی ئێرانی بێ ئەوا بێگومان لەسەر وشەی (کورد) دەگیرسێینەوە کە لە هەموو شوێنێکی ئێراندا ناوی ئەم میللەتە وەکو ڕۆژی روناك دیارە. لە کەنداوی فارسەوە تا دەریای خەزەر، لە مازندەران، خۆراسان، ئەفغانستان، ئەسفەهان، کرمان، خوزستان، ئەران —ئازەربایجانی قەفقاز- ئەرمەنستان، کارداکیە، لە رەبیعەوە تا سیواس و ئەسکەندەرون.

(تدسکو)ی ڕۆژهەڵاتناس هەندێ پەیوەندی لە نێوان بلوچ و کوردا کەشفکرووە، بڕوانە کتێبی (تاریخی کوردو کوردستان، ئەمین زەکی بەگ).

ئەمین زەکی بەگ لە مێژووەکەی خۆیدا دەربارەی کتێبە ئاینیەکانی زەردەشت کە لە سەرەتاکانی سەردەمی ساسانیدا نووسراون، دەڵێت: "لە راستیدا ئەم کتێبانە وا لە مرۆڤ دەکەن" کە بڵێت: "زۆر لەگینە زمانی پەهلەوی لە بنەڕەتدا زمانی کوردی ئەمرۆ بووبێ یا بنەڕەتی زمانی کوردی ئەمرۆ بووبێ، چونکە وشەکانی زۆر لە کوردی دەچن، بۆ نموونە (دینکرد) کە باسی مێژووی ئەدەبیات و یاساکانی ئاینی زەردەشت دەکات پەیوەندییەکی زۆری بە (دینی کورد)ەوە هەیە، و بگرە هەر (دین)ی (کورد)ە. یا (دانستان دینیك) بە چ مەعلوم (داستان دینیك) نەبێ کە بە

تەواوی بە زمانی کرمانجی ئەمڕۆیە. (شکندکوماتیك وی جار) کە بۆ بەرگری لە ئاینی زەردەشت نووسراوە، زۆر لە زمانی کوردی نزیکە".

لە راستیدا (شکندکوماتیك وی جار) لە کرمانجی ئەمڕۆدا مانای ئەمەیە کە (ئەمجارە هەموویانی شکاند) کە ئەمە بە تەواوەتی کوردیە.

(دامیس تیتر) لەو باوەڕەدایە کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان بە زمانی ماد نووسراوە. بە گوێرەی قەواڵەیەکی بابلی ئەوە دەردەکەوێ کە خەڵکی بابلی زۆر لە هێرش و پەلاماری گوتیەکان ترساون. دەڵێن گوتیەکان خەڵکانی هوڤی و دڵڕەق بوونە و ناوچە ئاوەدانەکانی میزوپۆتامیایان غەرقی خوێن و ئاگر کردووە.

سەبارەت بە مادەکانیش، مێژووی یەهود، ماد بە ئالەتی غەزەبی یەهوە دەژمێرێ. پێغەمبەرانی ئیسرائیل دەیانگوت یەهوە (خوا) شادمانە کە بە هۆی مادە بێ بەزەیی و دڵڕەقەکانەوە ترس و لەرزێکی گەورەی خستووتە دڵی بابلییەکانەوە.

کوردەکانی ئەمڕۆن کە پاشینانی ئەوانن، گەرچی حکومەتێکی تایبەتی خۆیان نیە، بەڵام بەهۆی بزووتنەوەی ئازادیخوازی خۆیانەوە ترسیان خستوەتە دڵی ئەو دراوسێیانەیانەوە کە هاونەژادی خۆیان نین بەڵام نەك بە زەبری دڵی رەقی، بەڵکو بەزەبری ئازایەتی و دلاوەری خۆیانەوە!... بۆیە دراوسێکانیان، بۆ ئەوەی ئەم میللەتە یەك نەگرێ، هەمیشە خەریکی ئەوەن ناتەبایی و دووبەرەکیان بخەنە ناو.

شەرەفنامە دەڵێت: "وەختێ بانگەوازی پێغەمبەرایەتی محەمەدی و سەداو بانگی پەیامی ئەحمەدی (د.خ) لە گۆشەو کەنارانی دنیادا دەنگیدایەوە، نوێنەری میللەتان بۆ وەرگرتنی دەستوور و ئیسلام بوون چوونە خزمەتی

حەزرەتی محەمەد.بەغدوز ناوێکی ناشیرین و رەزا قورسی کورد دەگاتە خزمەتی حەزرەتی محەمەد، حەزرەت کە چاوی بە رواڵەت و هەیبەتی دەکەوێت، ناچێتە دڵییەوە و پەست دەبێ. ئیدی پرسیاری هۆزو تیرەی کابرا دەکا، ئەویش دەڵێ لە هۆزی کوردانم، پێغەمبەر دەفەرموێ خوا ئەم تیرەیە یەك نەخات دەنا دنیا وێران دەکەن".

فرج الله زەکی، کە شەرەفنامەی چاپ و بڵاوکردووەتەوە لە پەراوێزدا دەڵێت: "ئەم قسەیە، قسەیەکی خورافیە، چونکە پێغەمبەران ناڕواننە رواڵەت، بەڵکو دەڕواننە رەفتارو ماهیەت، و ئەرکیان رێنوێنی کردنی خەڵکە بۆ خواناسی، و دوعای خێریان لەسەرە نەك دوعای خراپ".

هەڵبەتە گومان لە خورافاتی بوونی ئەم قسەیە نیە، بەڵکو تەنیا نیشانەی ئەو ترس و لەرزەیە کە ئەم میللەتە دەیخەنە دڵی نەیاران و ناحەزانی خۆیانەوە!.

((٣))

## ئاراراتیەکان

سلمان نصری یەکەمی پاشای ئاشور، بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٢٦٠ پ.ز) نێوی ئاراراتی بردووە.
قامووسی کتێبی پیرۆز ی (مستەرهاکس)ی ئەمریکایی کە بۆ فارسی ئامادەو تەرجوومە کراوە دەربارەی ئارارات دەنووسێت: "ئارارات هەرێمێکە لە مەرکەزی ئەرمەنستان، کەوتووەتە بەینی روباری ئاراس و دەریاچەی وان و ورمێ. هەندێ جار ئەم ناوە (ئارارات) بە هەموو ئەو وڵاتە وتراوە. لە قسان کەشتیەکەی نوح لەسەر ئەم کێوە گیرساوەتەوە. ئەم کێوە بەرزە کە ئەرمەنیەکان (میسیس)ی پێدەڵێن، تورکەکان (ئاگری داغ)و ئێرانیەکان (کێوی نوح)و ئەوروپاییەکان بە زۆری (ئارارات) و عەرەبەکان (جودی) پێدەڵێن. (جودی، کێوێکی دییەو لە باکووری موسڵە)، هەفدە هەزار پێ لە رووی دەریاوە بەرزەو یەکێکە لەو چیایە گڕکانیانەی کە دوا تەقینەوەی لە ساڵی ١٨٤٠دا بووە. (راستە گڕکانیە، بەڵام تا ئێستا کەس نەیتوانیوە رۆژو ساڵی دوا تەقینەوەی دیاری بکات).

(دمرگان)ی مێژوونووس، باسی دەوڵەتی بەهێزی ئارارات دەکات و دەڵێت: "هۆزی ماد، کە لە ساڵی دوو هەزاری پێش زایندا لە قەفقازەوە دێن و کە دەوڵەتی بە هێزی ئارارات لە ڕێگەی خۆدا دەبینن، ڕێی خۆیان دەگۆڕن و لە رۆژهەڵاتەوە رەت دەبن. (هۆزی ماد: دەبێ لێرەدا مەبەستی کاسیتەکان بێ).

بوونی ئەم دەوڵەتە لە ساڵی (٩٠٠ پ.ز) واتە لە سەردەمی حوکمڕانی زوحاکدا ئاشکراتر بووە. نزیکەی ساڵی (٨٠٠-٨١٥ پ.ز) (منواش)ی پاشای ئارارات بەرەو باشور هاتووەو هەرێمی پارسواو ماننائی داگیر کردووەو بەربەستێکی بتەوو قایمی لەبەردەم ئاشوریەکان دروستکردووە، کە دەبێ ئەم (منواش)ە هەمان مەنوچەهری شانامە یا (منوش چتر)ی ئاوێستا بێ.

لە ساڵی (٨٨٢- ٧٧٣ پ.ز)دا (سارودوریس)ی پاشای ئارارات، سلمان نصری سێیەم، پاشای ئاشوری شکاندووە.

هیرودوت دەڵێت: لە دەوروبەری کێوی ئارارات قەومێك بە نێوی (ئالارود) هەبوونەو (هالدی)یان دەپەرست. لە ساڵی (٦٠٠ پ.ز) ئەرمەنییەکان هاتن و خاکی (ئالارود)یان داگیرکردو ئاینی (ئالارود)یان قەبوولکرد، ئیدی بە خۆیان نێوی (هالدی، هایتی)یان لە خۆ ناو ئەو ناوچانەی کە داگیریان کرد، ناویان نا (هایستان).

عەلی ئەسغەر شەمیم هەمەدانی لە کتێبی (کورد)دا دەنووسێت: "کە دەوڵەتی ئاریانی میللەتانی خالدی یا کاردو بە دەستی ئەرمەنییەکان لە نێو چوو، نەبووە مایەی فەوتان و نەمانی ئەو شوێنەوارو ئاسەوارانەی کە خالدی، یا کاردۆکان لە ماوەی سێ سەدەدا لە شوێنی خۆیاندا دروستیان کردبوو یا بە جێیان هێشتبوو. بەڵکو دوای کۆچکردنی خالدیەکانیش بۆ کۆجارەکان، ناویان لە ناوچەی باکووری دەریاچەی وان دا، واتە تەرابزونی

ئەمرۆدا مایەوە.ئەم ناوچەیە لە سەردەمی رۆمی رۆژهەڵاتی بیزانسدا، خیلات یا (ئالخات)ی پێدەگوترا. تا ئەمڕۆش شارێکی کۆن لە کەناری باکووری رۆژاوای دەریاچەی نێو براو بە نێوی (ئەخلات) هەیە.

کتێبی: (ایران نامە یا کارنامە ایرانیان در عهد اشکانیان) دەربارەی ئاراراتیەکان دەنووسێت: "بەر لەوەی ئاریەکان ببنە خاوەنی ئەو هەرێمە، چەند تیرەیەکی تورك لەوێندرە نیشتەجێ بوونە، لەوانە: تیرەی (نایری) لە کۆسارەکانی رۆژاوای وان و هەردووك رەخی دیجلە بووە. تیرەی (مینویی- minui) لە باشورو رۆژاوای دەریاچەی ورمێ، لە نزیکی کێوی زاگروس بووە. تیرەی (ئورارود- urardu) لە باکووری رۆژهەڵاتی ئاقاری (نایری) بووە. (ئورارادو) لە هەردوك تیرەکەی دی بەهێزتر بووەو هەمیشە لەگەڵ ئاشوردا لە شەڕ و شۆڕدا بوودو (وان)ی ئێستا مەڵبەندیان بووە. لەو بەردەنووس و کەتیبانەی کە لە سەرانی ئەوان بەجێماون، نێوی شەش کەس ئاشکرا بووەو لەگینە ئەمانە لە یەك خێزان و بنەماڵە بووبن و دوا بە دوای یەك حوکمڕانیان کردبێ، یەکێك لەو شەش کەسە (ارکیستس) پاشایە کە لەگەڵ (سارگن- ٧٢٠- ٧٠٠ پ.ز) پاشای ئاشوردا شەڕی کردووە. یەکێکی دی (بلات دری) یان (سردورس)ی سێیەمە کە لەگەڵ ئاشور بانیپاڵ دا لە ساڵی (٦٤٤ پ.ز) کێشەی هەبووە. سنووری وڵاتی (ئورارادو) بە هەموو ئەو سەر زەمینە تەخمین دەکرێت کە ئێستاکێ بە نێوی ئەرمەنستانەوە ناسراوە. هەندێ شوێنەوارو ئاسەواری ئەم ماڵباتە لە ملاتیە، پالو، میاندواب. پاشایانی ئەوێندەر بە خۆیان گوتووە (شای نایری).

لە گۆڤارێکی فارسیدا، وتارێك لە ژێر سەر ناوی (ئەرمەنستان) نووسرا بوو کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

له سەدەی نۆزدەدا کە رۆژهەڵاتناسان لە کێوەکانی ئێران و ئەرمەنستان و ئاشوردا خەتە هەڵکۆڵراوەکانیان خوێندەوە، پەیان بەوە برد کە لەساڵی سێ هەزاری پێش زایندا خەڵکێکی زۆر لە بەشێکی ئەرمەنستاندا بە نێوی (سوباری) هەبوونەو مێژوو نێوی چەند دەستەو گروپێکی تری لە نێو ئەواندا بردووە، لەوانە: خات، هات، خالدی، هیتد، ئالورود و هاباس.

لەو سەردەمەدا لە ئاسیای بچووکدا، حوکمڕانانێك هەبوونە بە نێوی: (ئورارتو، بێ ئانا، عوسایر، ملید، میل دیس، نایيری و مانا) کە ئەمانە لە خەتی ئاشوریدا بە وڵاتی نایيری زانراون. لە سەدەکانی دواتردا هەموو ئەم حوکمڕانانە یەکیان گرتووەو دەسەڵاتی (ئورارتو) یان دەمەزراندووەو پایتەختەکەیان (گوسبا) بووە کە ئێستا بە (وان) ناسراوە.. لێرەدا، ئورارتو و مانائیش بە مەملەکەتی نایيری نێو براوە.

تیگلات پلیسری پاشای ئاشورش لەم بارەیەوە دەنووسێت، میللەتی نایيری لە دەوروبەری سەرچاوەکانی دیجلەو فوراتدا، پانی لە نیشتمانی ئاراراتیەکان، دەژیان، لە باکووری نیفاتس تا دیاربەکر، خەرپوت، دەرسیم و کێوەکانی نەتلیس- گوروس یان گرتبوو. (بڕوانە: مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی).

بەمەدا وا دیارە کە (ئاراراتیەکان)یش لە (نایيری)یەکان بوونەو پاشان ئەرمەنیەکان هاتوون و ئەو وڵاتەیان داگیر کردووە.

لە زەمانی مادەکاندا، فەرماندەی ئەرمەنستان لەلایەن مادەوە دادەنرا. پاش لە نێو چوونی ماد، کوروشی گەورە، ئیمپراتۆریەتی ئێرانی دامەزراند، ئەرمەنستان بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی ئێران، و تا سەردەمی داریوشی سێیەم مایەوە. فەرماندەکانی وێندەر (وندفرنە) یا (هیدرانس)

هەڵدەبژێردران. بە گوتە سترابون تا سەردەمی (ئانتوکوس)ی گەورە، پاشا سلوکوس لە ئەرمەنستاندا حوکمڕانی کردووە (٥٥٩- ٢٢٣ پ.ز) (بڕوانە: ایران باستان)

هەر چەندە کتێبی (ایران نامە) ئەم تیرانەی بە تورك لە قەڵەم داوە، بەڵام دۆزینەوەو دوا ئیکتیشافاتەکان سەلماندویانە کە ئەمانە لە نەژادی ئارین.

لێکۆلەران، میتانیەکانیان بە ئایری لە قەڵەم داوە، کە هیچ گومانێك لە ئاریایی بوونیان نییە. ئاشوریەکان، ماننائیەکان وەکو لە کتێبی مینوئی دا تۆمار کراوە، بە خزمی مادەکان دا دەنێن، تەنانەت یەکەم پاشای ماد (دیاکو) سەرۆکی عێڵی ماننایی بوو. لە بنەڕەتدا (ماد، ماننایی، سیت، کیمری) لە مێژوودا بە (ئوممان- ماندا) ناسراون کە هەموویان لە یەك نەژادو ئاریایی بوونە. سنوورو ئاقاریان گەییوەتە کەنارەکانی دەریای رەش کە ئاراراتیەکانیش لە چوار چێوەی ئەو سنووورەدا بوونە.

هەمان کتێب دەنووسێت: (پاشایانی ئارارات بە خۆیان دەگوت شای ئایری، بە زمان و ناوی ئاراراتیەکاندا دەیارە کە ئاریایی بوونە، لە راستیدا، لە کۆنا مادەکانیشیان لەگەڵ ئەو تیرانەدا بە تورك یان سامی نەژاد دەزانی. لە ئەنجامی پشکنین و کۆڵینکاری پاشتردا چەند قەباڵەیەك دۆزرایەوەو ئاری بوونی مادەکانی ساغکردەوە.

دوا پاشای ئارارات نێوی (ئاری مینا) بووە. ئەو سپەرە برونزیانەی کە ئەم پاشایە پێشکەش بە پەرستگەی کردبوون، ئەمڕۆ دۆزراونەتەوەو وا دەردەکەوێ کە فەرمانڕەوایی (ئاری مینا) لە سەرەتاکانی سەدی شەشەمی پێش زاین بووە.

داریوش یەکەم لە کەتیبەی (بەردەنووس) بێستووندا ئەرمەنستانی بە ئارمینا نێو بردووە. ئارارات وشەیەکی عیبریە، هیرودوت، (ئالارود)ی پێگوتووەو ئاشوریەکان (ئورارتو)یان پێگوتووە. (مایەر)، نیشتمانی ئەسڵی ئەم تایفەیەی بە ئاراسی مەرکەزی زانیوە، هەندێ سەرچاوەی مێژوویی ئەو، ئەوێ بە شوێنی ئارزانتەکان، کە یەکێکە لە شەش تیرەکەی ماد، دەزانن. لەوەشە وشەی ئارارات و ئارزانت جۆرە پەیوەندییەکیان لە نێوان دا هەبێ.

لە دەوروبەری حەزودا —لە کوردستانی باکوور- زنجیرە کێوێکی بەرز هەیە نێوی (مارارتو) بووە و ئێستا بە (مالاتو) ناسراوە. عەرەبەکان وشەی (مارارتو)یان بە مەعنای (رەت بووم) لێکداوەتەوە. دەڵێن وەختێ کەشتیەکەی نوح بەسەر ئاوەوە بووەو ئاوەکە کەم بووەتەوە، کەشتیەکە بەسەر ئەم لوتکەیەدا تێپەڕیوە، حەزرەتی نوح فەرموویەتی: ((مررت)) ئەم وشەیە پاشان بووە بە نێوی ئەم کێوە.

بە گوێرەی ئەم ئەفسانەیە دەشێت بگوترێ کە نێوی یەکەمی ئەم زنجیرە کێوەش (ئورارتو) بووە، عەرەبەکان کردوویانە بە (مررت). دیارە ئەم دوو کێوە نێوەکانیان لە یەك تیرەوە وەرگرتووەو لە راستیدا ئاسەواری پاشایانی ئارارات لە (مەلاتیەو پالو)دا دۆزراوەتەوە.

تیگلات پلیسری ئاشور، لە کۆجاری ئازو-حازو-دا نێوی تیرەی کورتیە دەبات، بەم پێیە تیرەی کورتیە، تیرەیەك بووە لە تیرەکانی (ئورارتو). سترا بوون ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ و باسی بوونی (کورتی، مرداسرد)ەکان لە ئەرمەنستانی خاکی ئاراراتیەکان دەکات، سەرچاوە مێژووییە ئەرمەنیەکان، لە ئاقاری حوکمرانی ئەرمەنیەکانا باسی تایفەیەکی گەورە بە نێوی (مار)

دەکەن. ئەم تایفەیە لە دەوروبەری دەریاچەی وان بووە. ئەمڕۆکەش لە نزیکی شاری وان دا دورگەیەکی بچکۆلە هەیە بە نێوی (اختمار).

ڤیکۆر لانگلوا دەڵێت: "ئەرمەنیەکان، بە مادەکان دەڵێن (مار) و بە پاشماوەی ئەژدەهاکیان دەزانن و دوا پاشای مادەکان بە زمانی ئەرمەنی (ویشتا بازونگ)ی پێوتراوە کە مانای (ئەژدیها زادەکانە). (ویشاب ئازون)ـە.

سەنحاریبی کوڕی سارگونی دووەم لە هەرێمێکی باکوورەوە بۆ باوکی دەنووسێت: "خەڵکێکی زۆر لە باکورەوە گوشار بۆ وڵاتی وان دێنن و (ئەرکیشتی دووەم)ی پاشای وان بە زەحمەت مقاوەمەت دەکات. ئەم خەڵکە (گامبر)یان پێدەڵێن". تەورات، بە (جومر) و مێژوونووسانی یۆنانی بە (کیمری) نێویان بردوون.

پایتەختی دەوڵەتی ئارارات شاری وان بووەو دانیشتوانەکەی (مار)ەکان بوونە. ئەم (مار)انەی ئەرمەنیەکان هەمان (مرد، ئەمردەکانی) (سترابون)ن کە پاشان ناوی کوردیان گرتووەتە خۆ. دیارە دەبێ ئەم تیرانە لە میللەتی ئارارات بووبن و پاش نەمانی دەوڵەتەکەشیان بە دەستی ئەرمەنیەکان، هەر لە شوێنی خۆیان ماونەتەوەو ژیارو شارستانیەتێکی بەرچاویان هەبووە، و باوەڕی ئاینی خۆیان بەسەر ئەرمەنیەکاندا سەپاندووە.

لە سەدەکانی هەوڵی بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحیەتدا، لە ساڵی (٢٧٥) مەسیحیدا (ترتات)ی پاشای ئەرمەنی بووە بە مەسیحی و لە دەوروبەری (موش)دا سێ هەزار کەسی لە سەرانی ڕۆحانی (هالدی) کوشتودو خەڵکەکەی کردووە بە مەسیحی، لەم بەینەدا بەشێك لە کوردەکانیش ئاینی مەسیحیان قەبوڵ کردووە، پاشان کە ئاینی ئیسلام بڵاوبووەتەوە کوردە

**هالدیەکانیش چاویان لە هاونەژادانی خۆ، کوردەکانی باشور کردو بوون بە ئیسلام. میللەتانی بندەست لە ژێر کاریگەریی هەستی ئازادیخوازیدا، کە ئەم هەستە غەریزەی ئاسایی هەر مرۆڤێکە، هەمیشە حەز دەکەن سەرپێچی لە رەفتارو کرداری میللەتی سەردەست بکەن و هەر رووداوێك دژی بیرو باوەڕی میللەتی سەردەست بێ، بەلای میللەتی بندەستەوە پەسندە، جا چونکە کوردانی ئاراراتی لە ژێر دەسەڵاتی ئەرمەنیەکاندا بوونەو ئاینی ئەرمەنیەکان مەسیحیەت بووە، بۆیە بە گەرمی روویان کردووەتە ئاینی ئیسلام و هەر کە بەشی زۆری هاو رەگەزەکانیان، ئیمانیان بە ئاینی ئیسلام هێناوە، ئەوانیش-یانی ئاراراتیەکان- بێ سێ و دوو چوونەتە ریزی موجاهدینی ئیسلامەوە کە هەڤرکی ئاینی عیسایی بوو: ژمارەیەکی کەم لەو ئاراراتیانە هەر لەسەر ئاینی مەسیحیەت مانەوە، کە نەوەکانی ئەمرۆیان بە ئەرمەنی دەژمێردرێن. چونکە لەو سەرو بەندە دێرینەدا بیروباوەڕی ئاینی بەسەر هەستی نەتەوەییدا زاڵ بووە، ئیدی کەوتوونەتە ژێر هەستی ئاینییەوە و نەژادو رەسەنی نەتەوەیی خۆیان فەراموش کردووە. ئەمرۆکەش لە نێو هەندێ تایفەی کوردا نیشانەی خاچ لەسەر هەویر دەکێشن کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەلگەی ئەوەیە کە ئەوان مەسیحی بوونە و پاشان بوون بە موسوڵمان.ئەمە جگە لەوەی بە پێی گێرانەوەی سەرچاوە مێژووییە ئەرمەنیەکان لە سالآنی ١٥٠-٢٠٠ زاینیدا، ئاینی مەسیحیەت لە نێو کوردەکاندا بلاوبووەتەوەو ژمارەیەکیانیش لە کۆسارەکانی (کوردوین)دا بە نهێنی باوەڕیان بە ئاینی عیسا هێناوەو مومارەسەیان کردووە، تەنانەت (سوکیاس) سەرۆکی عیساییە نهێنییەکانی کورد، بە دەستی هاوشاریە بتپەرستەکانی خۆی کوژراوە.**

لە ڕاستیا، عیسایییەکانی ئاکنجی کۆچاڕانی سەخت و ئاسێی کوردستان لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دەریاچەی وان و دەرسیم تا سەردەمی یەکەم جەنگی جیهانیش بە هیچ جۆرێ زمانی ئەرمەنییان نەدەزانی و هەر بە کوردی قسەیان دەکرد. دیارە ئەمانە ئەو کوردانە بوون کە باو باپیرانیانی لەسەر ئاینی عیسایی مابوونەوە دەنا هیچ میلەتێ لە سایەی دەسەڵاتی نەتەوەیی خۆیدا زمانی زگماکی خۆی فەرامۆش ناکاو بە زمانی میللەتی بن دەستی خۆی قسە ناکات. کوردە موسوڵمانەکانیش ئەوانیان، چونکە مەسیحی بوونە، هەر بە ئەرمەنی زانیوە، کوردەکانی ئەو ناوچانەش جگە لە میللەتی ئەرمەنی پەیوەندییان بە مەسیحیانی دیکەوە نەبووەو هەموو مەسیحییەکیان بە ئەرمەنی داناوە. ئەمڕۆکەش هەر وایە.

لە یەکەم جەنگی جیهانیدا کە دەوڵەتی عوسمانی ئەرمەنیەکانی بندەستی خۆی قەتڵ و عام کرد، ژمارەیەك لەم کوردە مەسیحیانەش کوژران، ئەوانەش کە توانیان بڕەڤن و لە سنووری دەوڵەتی عوسمانی دەرباز بن، لەگەڵ ئەرمەنییەکانی دی دا تێکەڵ بوونەو سەر لە نوێ زمانی ئەرمەنی فێر بوونە.

سەردەمانێ نایرییەکان، کە ئاراراتیەکانمان بە بەشێك لەوان زانیوە، و سەردەمانێکیش موشکیەکان لە خاکی ئاراراتیەکاندا حوکمڕانیان کردووەو هەموو کوردستانی باکووریان داگیر کردووەو شاری (موش) پاشماوەو یادگاری ئەم هۆزەیە.

تەورات، کتێبی پیدایش (١٠:٢٣)، ناوی ئەم هۆزە بە (ماش) تۆمار دەکات و دەڵێت کە لە باکووری جەزیرەدا نیشتەجێ بوونەو ڕەگەزیان دەچێتەوە سەر (یافپ)ی کوڕی نوح. جا چونکە گومانی ئەوە دەکرێ نەوەی (یافپ) لە

١ نزیکی سەرچاوەکانی دیجلەدا نیشتەجێ بوونە، بۆیە پێدەچێت موشکییەکان تا باکوری جزیرەیان خستبێتە ژێر دەسەلاتی خۆیان، لە سەدەی هەشتەمی پ.زدا، پاشای لیدی میتاس-یان لە مێژوودا بە (میتای و موشکی) نێو بردووە، لە سالی ٧٧٠ پ.ز دەگەل (روسا)ی پاشای ئاراراتدا یەکی گرتووەو لەگەل سارگنی دووەمدا شەڕی کردووە. بەپێی باوەڕی هەندێ کەس لەو سەردەمەدا (ئورارتو) بەشێك بووە لە ماد.

لە خاکی ئاراراتیەکاندا دوو میللەتی تر ژیاون، یەکیان ئەرمەنیەکان بووەو ئەویتریان بە گوتەی هیرودوت ئالارودییەکان بووە. پاش سەدان سالیش هەردوو میللەت لەو هەرێمە بوونە، یەکێکیان ئەرمەنیەکان بووەو ئەویتریان کورد بووە. جا چونکە سەرچاوە مێژووییە ئەرمەنیەکان هیچ ئاماژەیەکیان بۆ لە بەین چوونی (ئالارودی)یەکان ناکەن، دەبێ هەر ئەو ئالارودییانە بووبن کە پاشان ناوی کوردیان گرتووەتە خۆ. ئەمە جگە لەوەی کە مێژووی کۆنی ئەرمەنی باسی کورتیەکان دەکا، و تەنانەت تاکێ لە چەکمەکانی وەزیری کورتی سوور بووە و تەنیا پاشا چەکمەی سووری لەپێ کردووە، ئەم خالە بەلگەی ئەوەیە کە بەر لە ئەرمەنییەکان. میللەتی ئارارات، (کوتی- کورتی) بووەو پاش تێشکانیش وەکو کەمە نەتەوەیەکی گرنگ لە نێو دەولەتی ئەرمەنستاندا ماونەتەوەو دەسەلاتیان زۆر کەم نەبووەتەوە، مادەکانیش لە کورتیەکان بوونە.

گەزنەفون دەلێت: "لەو شەڕەی کە (ئاستیاکس)ی پاشای ماد دەیویست لەگەل بابلییەکاندا بیکات، پاشای ئەرمەنستان کە باجدەرو باجگوزاری ئاستیاکس بوو لەشکری نەدایە ئاستیاکس، کوروش بۆ تەمێ کردنی پاشای ئەرمەنستان بە لەشکری ماد بەرەو ئەرمەنستان چوو و لە ئەنجامدا کوروش

قایل بوو بەوەی کە پاشای ئەرمەنستان، چونکە لەگەڵ کلدانیەکاندا شەڕی بوو، نیوەی لەشکرەکەی بهێڵێتەوەو نیوەکەی تری بنێرێتە یاریدەی کیاکسار".

مەبەستی گەزنەفۆن لە کلدانیەکان، ئەو خالدییانەیە کە بەر لە چوونی ئەرمەنییەکان بۆ ئەوێ، خەڵکی ئەرمەنستان بوونە.

لەسەرڕێڕا ئاماژە بۆ ئەوە کرا بوو کە کلدانیەکان لە ڕەگەزی جیاواز پێکهاتبوون کە یەکێك لەو ڕەگەزو ڕەسەنانە کوتیەکان و کوسیە ئاریایی نەژادەکان بوونە کە گەزنەفۆن ئاراراتیەکانیش بە بەشێك لەوان دەزانێ.

گەزنەفۆن، لە کەوشەنی ئەرمەنستاندا باسی پاشا هند دەکا کە مەعلوم نییە لە کام هۆزو تیرە بووە. بۆ نموونە لە شوێنێکا دەڵێت کوروش داوای لە پاشای ئەرمەنستان کرد کە ڕێنوێنانی (دەلیل) بداتێ تا قاسیدێك بنێرێتە لای پاشا هندو پارەی لێ داوا بکات. لە شوێنێکی دی دا دەنووسێت: قاسیدی پاشا هند هاتە لای کیاکسارو پێی گوت بیستوومانە دەتەوێ لەگەڵ پاشای ئاشوردا شەڕ بکەی، من دەچمە لای پاشای ئاشوریش بزانم کام لا دەست درێژکار بێ لایەنی لایەکەی دی دەگرم.

بە کورتی، جارەکی دی دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە گوتیەکان لە دەریای ڕەشەوە تا باکووری عیلام ناوچەیەکی شاخاوی و سەختیان داگیر کردووەو لەگەڵ هۆزو تیرە زۆرەکانی خۆیاندا دەوڵەتانی سەربەخۆیان دامەزراندووەو هەر کاتێ تیرەیەك لەو تیرانە تواناو دەسەڵاتی پەیدا کردووە، پەلاماری هۆزە دراوسێکانی خۆی داوەو خستونیە ژێر ڕکێفی خۆی و سنووری نەتەوەیی خۆی بەزاندووەو خاکی میللەتانی دی داگیر کردووەو ساڵانێك لەو ناوچەو مەملەکەتە بەربڵاوانەدا حوکمڕانی کردووە. سەبارەت بە لێهاتووی

و ئازایەتی پاشای ئەو میللەتە، لە نێو هەموو میللەتدا بە شاهنشا ناسراوەو ناوی چووەتە گۆرانی و ئاوازە میللییەکانەوە. ئەوەی کە سەلماوە ئەوەیە کە کۆڵەکەی کۆمەڵگەی کوتیەکان لە (کورتی، نایری، کوسی و ئامـاردی)یەکان پێکهاتووە. هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەوان لە گۆرانیە میللەییەکانی خۆیاندا، ج جیاوازییەکیان لە نێو پاشایانی ئەو هۆزو تیرانەدا نەکردووەو هەموویانیان بە پاشای خۆیان زانیوە، بۆیە پێدەچێت ئاراراتیەکان بەشی باکووری کارداکان بووبن.

هیرودوت لە نێو قۆشەنی (اکسرس Xerxes)دا لەشکری کورد بە (ئالارادی ین و ساسپری ین) نێو دەبات. لە باکووری ئەرزروم و سنووری تەرابزونی ئێستادا شارێکی کۆن هەیە و نێوی (ئەسپیر)ـە. خەڵکی ئەو ناوچەیە هەر چەندە زمانی کوردیان فەرامۆش کردووەو بە تورکی دەپەیڤن، لێ بە خۆیان دبێژن ((کرداسپیر).

نێوی (کورتی، مرد، ئەمردەکان) لە هەموو شوێنێکدا پێکەوە هاتووە، تەنانەت هەندێ مێژوونووسی عەرەب کە رەگەزنامەی ساختەیان دروستکردووە (کورد)یان بە کوڕی (مرد) داناوەو لە راستیا مەعنای (کورد، مەرد، مەردایەتی) دەکرێ بە یەك شت بزانرێ.

(راپسك)ی رۆژهەڵاتناس دەڵێت: (خالدی، کوردی، کورتی، الکردی) لەگەڵ نێوی کوردەکاندا هاوبەشە. (بڕوانە ئەنسکلوپیدیای ئیسلام).

(درافەر)ی رۆژهەڵاتناسیش دەڵێت: (کاردا، کارتوخی، کورتوخی، غوردی، کارداك، سیرتی -کورتی- غوردیای، غوردویەتی، کاردا، کارداویە، کاردایە، کارتاوایە) هەموویان لەگەڵ کوردیا یەکن، (بڕوانە تاریخی کوردو کوردستان).

عێلی گەورەی میلان خۆیان بە (خالدی) دەزانن و چونکە ئاگایان لە مێژووی کۆنی خۆیان نییە وا تەسەور دەکەن لە نەوەی خالیدی کوڕی وەلیدن، خۆ ئەگەر خالدی بن ئەوا دەبێ بە نەوەی خالدییەکانی ئارارات بزانرێن، وەکو چۆن بنەماڵەی بەڕێزی بەدرخان پاشای میری بۆتان لە نەوەی خالدییەکانن.

لە هەندێ شوێندا بە (میتانیەکان) گوتراوە میتلانی، لەوەیە میلانی لە میتلانییەوە هاتبێ، شوێنی ئەسڵی (میلانیەکان) لە دەوروبەری دیاربەکر بووە، واتە لە نیشتمانی میتانیەکان بوونە. لەم حاڵەدا دەبێ میتانیەکان لەگەڵ خالدییەکاندا بە یەك بزانرێن.

میتانیەکان لە کەنارەکانی دەریای رەشەوە هاتبوون، لە سەردەمی (بیزانس)ی ئیمپراتۆری رۆمدا شوێنێك لە کەناری دەریای رەشدا هەبووە بە ناوی خالدی. لە ناوچەی قەفقازیشدا ئەم ناوە -خالدی- بەرچاو کەوتووە. دیارە هەموو ئەم شرۆڤانە ئەوە دەسەلمێنن کە هۆزانی (خالدی، نایری، میتانی، سوباری، موشکی، بە تایبەتی گوتیو کورتی هاو نەژاد بوونە.

★ ★ ★

رەشید یاسمی لە لاپەڕە (١١٤)ی کتێبی: کردو پیوستگی نژادی و تاریخی او)دا دەنووسێت: "لە کتێبی التنبیە والاشراف‌ی مەسعودیدا کە بەپێی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەی ئەهلی لێکۆڵینەوە، ئەو بەشەی پەیوەندی بە ئێرانەوە هەیە لە سەرچاوە سەرەکیەکانی ساسانیەوە وەرگیراوەو ئەو رەگو ریشەیەی سەبارەت بە کوردەکان نیشانی داوە، پێدەچێت لە سەرچاوە پەهلەوییەکانەوە وەری گرتبێ. مەسعودی لەم کتێبەدا هۆزە کوردەکانی ژماردووەو بە نەوەی کوردی کوڕی ئەسفەندیاژی کوڕی مەنوچەهری

پشدادی زانیون. له راستیا ئەم نووسەره له هەر شوێنێکا پشتی بەسەرچاوه پەهلەوییەکان بەستبێ، کوردی بە نەوەی سوڵتانەکانی ئێران حەساو کردووه".

ئەم روونکردنەوانە تەواو پشتیوانی لە بۆچوون و سەرنجەکانی ناو ئەم کتێبە دەکات تەنیا لە یەك شت دا نەبێ کە کوردەکان بە نەوەی سوڵتانەکانی ئێران دەزانێ، حاڵبوکی وا نیەو سوڵتانەکانی ئێران نەوەی کورد بوونەو پاشان هۆزەکانیان ناوی کوردیان گرتۆتە خۆ.

کیومرپیان، له نەوەی گوتیانن.

جەمشید،له نەوەی کوسی، کاسیتەکانه.

فەرمیدوون و نەوەکانی، له ئاراراتیەکان و مانناثیەکان و مادەکانن.

مادەکان، له کوسییەکانن.

هەخامەنشیەکان، له کوسەکانن.

پەهلەویەکان، له نەوەی پارپ، پەرپۆکانن.

ساسانییەکان، لە نەوەی شوانکارەن و هەر هەموو ئەم هۆزو تیرانە لە کۆمەڵگای کوردەواری ئەمڕۆدا دەبینین.

★ ★ ★

مێژوونووسانی کۆن کە بە دروستی ناوی پاشایان‌و شوێنی رووداوەکانیان تۆمار نەکردووه، هەڤیان بووه، چونکە مێژووی ماد، ئاشورو عیلام مەعلوم نەبووەو شانامە باسی ئەم ناوانەی نەکردووه.

لە ساڵی (١٦٢١ز)دا گەڕیدەیەکی ئیتاڵی بەردەنووسی تەختی جەمشیدی رەسم کرد، (بوتا)ی کونسوڵی فەرەنساش لە ساڵی (١٨٣٥ز)دا لە موسڵ

هەندێ خەتی لەسەر بەردی خەرابەی کۆشکێکی کۆندا دۆزییەوەو ناردی بۆ فەرەنسا و پاشان شاندێکی زانستی لە فەرەنساوە هاتە ئەوێندەرو دەستیان بە تەحقیقات کردو نووسراوە کۆنەکانیان دۆزییەوە، خوێندیانەوەو مێژووی کلدەو ئاشوریان روونکردەوەو لە پاڵ ئەمەدا مێژووی مادیش روون بووەوە. چونکە ئەو سەردەمە، سەردەمی ئاین و ئاینداری بوو، کوردەکان ئەوەندە بە خەمی مێژووی نەتەوەیی خۆیانەوە نەبوونەو چونکە بە سەدان ساڵ ل نیعمەتی رۆشنبیریی و خۆیبوونی تەواو مەحروم و بێ بەش بوونە، بۆیە ئومێدیان بەوە نەبووە کە ببنە خاوەنی مێژوویییەکی پڕ لە شانازی و لەم بارەیەوە کارو کۆششێکی ئەوتۆیان نەکردووە. هیچ نووسراوێکی پڕ بایەخ لە پاش پاشاکانی ماد بە جێ نەماوە، دیارە ئەوانیش وەکو نەوەکانی ئەمڕۆی خۆیان —واتە کوردەکان- لە خۆ نواندن دوور بوونەو کاری ئازایەتی و قارەمانێتیان بە تاقە چالاکییەکی خۆ ناساندن زانیوەو شانازیان بە شمشێرەوە کردووە و بیریان لە داهاتوو نەکردووەتەوە.

هەر چەندە هەندێك دەڵێن هیچ شتێك بە زمانی ماد نەگەیووەتە دەستی ئێمە، بەڵام لەم کتێبەدا روونکراوەتەوەو نموونە هێنراوەتەوە کە زمانی کوردی ئەمرۆ بە ڕای کۆمەڵێك رۆژهەڵاتناس زادەی پەردەسەندن و گۆڕانکارییەکانی زمانی مادە.

داریوش شا، زۆربەی بەردەنووسەکانی خۆی، بە تایبەتی بەردەنووسی (کەتیبە) بێستونی بە سێ زمان، واتە زمانی ئاشوری، عیلامی، پارسی نووسیوە، دیارە بێستون مەرکەزی مادەکان بووەو خۆ ئەگەر زمانی ماد لە زمانی بەردەنووسی بێستون جیا بووبێ، واتە زمانی ماد لە زمانی کەتیبەکەی بێستون جیا بوو بێ، ئەوا لەبەر ئەوەی مادەکان زۆربەی

دانیشتوانی ئێران بوونەو بۆ ئەوەی حاڵی ببن، ئەوا ناچار دەبوو لە پاڵ زمانی ئاشوری و عیلامی و پارسیدا زمانی "ماد"یش بەکار بێنێ. لەبەر ئەمە ئەگەر بڵێین بەردەنووسی بێستون بە زمانی پارسی نەنووسراوە بەڵکو بە زمانی مادی نووسراوە، ئەمەیان لە ئەقڵ و لۆجیکەوە نزیکترە.

باشترین بەڵگەی یەکێتیی بنەماڵەی پاشایەتی (ماد- ئەنزان) ئەمەیە کە مادەکان (ئیختوویکو)ی پاشای خۆیان بە دەستی خۆیان گرت و تەسلیمی (کوروش)یان کرد، میللەتی ماد بە رەزامەندی خۆیان (کوروش)یان هێنا بووە سەر تەختی مادەکان، خۆ بە گوێرەی دابونەریتی کۆنی ئێرانیەکان، دەبێ ئەوە قەبوڵ بکرێ کە میللەتی (ماد- ئەنزان) یەکێك بووەو چ جیاوازییەکیان نەبووە، دەنا ئەگەر میللەتی ماد پاشای خۆشیان ترۆ کردبووبێ، ئەوا نەیاندەدایە دەستی بێگانە و دژمن و بابایەکی بێگانەیان نەدەکرد بە پاشای خۆیان، چونکە کودەتاکە لەلایەن وەزیران و فەرماندەکانی مادەوە ئامادەو ئەنجام درابوو.

(ناپوئید)ی پاشای بابل دەڵێت: ئەو، واتە ئیختو و ویکو، سوپایەکی کۆکردەوەو چوو بۆ شەڕی کوروش، سوپاکەی یاخی بوون و شەڕیان نەکرد. (ئیختوو ویکو)ی پاشای خۆیان بە دەستی خۆیان گرت و تەسلیمی (کوروش)یان کرد، پاشان کوروش هاتە هەمەدان، زێڕو زیوو سامانێکی زۆری بۆ ئەنشان برد (بڕوانە کتێبی: تاریخ ایران باستان).

مادوپارس، دوو تیرەی هاو نەژاد بوونەو دراوسێی یەکدی بوونە. هۆزی (کورتی، مەرد، ئەمرەدەکان) لە هەردوو ناوچەکەدا نیشتەجێ بوونە، بەلام مەڵبەندیان مادستان بووە. لە زەمانی کتزیاس، دکتۆری تایبەتی ئەردەشیری دووەمی هەخامەنشیدا مادو پارس بە چاکی لە زمانی یەکدی حاڵی دەبوون.

مێژوو، داریوشی گەورە، بە زڕ کوڕی هوخشترەی پاشای ماد تۆمـار دەکات، و لـە سایەی ئـەودا بـووە کـە توانیویـەتی لـە پایتـەختی مـادا ببێ بـە پاشـاو خۆیبوونخوازانی ماد، سەرکوت بکات.

★ ★ ★

ئـەو سەرچاوە مێژووییـە ئێرانییانـەی کـە پـاش ئیـسلام نووسـراون، نـاوی مادەکانیـان نـەهێناوە، چـونکە لـەو زەمانـەدا میللـەتی مـاد نێـوی کـوردی گرتبووە خۆ.

لە مێژووی دامەزرانی دەوڵەتی ئێرانەوە تـا (دیـاکو- کـەیقوباد- هـەموو ئـەم پاشایانەی کە هاتوون و ڕۆیشتوون، بە تەقلیدو چاوڵیکەری پرزاتـی ئاوێـستا لـە ژێـر نـاوی (پـشدادیان)دا تۆمـار کـراون. بـەڵام ئـەمڕۆ، کـە مێـژوو تـا ئەندازەیـەك ڕوون بووەتـەوە، ئێمـە دەتـوانین ئەوانـە بەسـەر سـێ زنجیرەدا دابەش بکەین.

١- گوتییەکان: لە بەرەبەیانی مێژووی زاگرۆسەوە تا ساڵی دوو هەزار پ.ز.
٢- کوسـی، کاسـیتەکان: لـە دوو هـەزاری پ.ز تـا هـەزار و سـەدو بیـست و پێنجی پ.ز، واتە تا فەوتان و نەمانی دەوڵەتی کوسی –کاردونیاش-.
٣- خالدی و ماننایيـەکان: لـە فەرەیدوونـەوە تـا دیـاکو-کـەیقوباد- نزیکـەی (٩٠٠- ٧٠٥ پ.ز).

ئـەم سـەردەمە ڕەونـەقێکی ئـەوتۆی نـەبووەو سـەردەمی حـوکمڕانی خـان خانـەکێ بـووە.. ئەگەرچـی لـەم سـەردەماندا: سـوبارییەکان، نایریـەکان، میتانەکان، موشکییەکان کە لـە کوتییـەکان بوونـە، حکومـەتانی گـەورەو بـە توانایـان دامەزرانـدووە. بـەڵام چـونکە لـە چیاکانی زاگروسـدا دەسـەڵاتیان نـەبووە ئیـدی نەخراونەتـە خانـەی ئێرانیەکانـەوە. تـەنیا سـنووری

سـوبارییەکان دەگەییـە شـوش کـە هەنـدێ لێکۆڵـەرەوە نـاوی جوگرافیـایی شوێنەکەو خودی میللەتەکەیان بە (گوتی) زانیوە.

((٤))

## نەمرودەکان

کتێبی (القچیه الکردیه) کە لە بڵاوکراوەکانی (خۆیبون- جڤاتی وەلاتی کوردا)یە دەنووسێت: "لەبەرە بەیانی مێژووەوە میللەتێك لە کۆجارەکانی نزیکی سوریادا نیشتەجێ بووە، ناوی (جوتو) واتە جەنگاوەر بووە". دەبێ ئەمانە لەو گوتیانە بن کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسیان لێوەکراوە.
ئەم ناوچەیە دەشتی نەمرود بووە. ئەو ئاوەی کە لە ناو ئاگرا پەیدا بووە، دەڵێن ئەمڕۆ لە نێو نەوەکانی جوتو، گوتوەکاندا زۆر پیرۆزەو کەس زات ناکات ماسی لەم ئاوەدا ڕاو بکات. ئەم ئاوە کەوتووەتە ناوچەی ئورفە (لە تورکیا).
قاموسی کتێبی پیرۆز دەنووسێت: "ئەرك، شارێك بووە لە کلدیە کە نەمرود لەسەر دیجلە دروستی کردووەو یونانی و ڕۆمانیەکان (ارکوی) یان پێگوتووە، دوور نییە ئەو (ئەرك)ە ئورفەی ئیستا بێ کە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی بابلەو هەندێك بە ئورفەی ئێستایان زانیوە، (ئورفە: لە باکووری ڕۆژاوای بابلەو نزیکی سەرچاوەی فوراتە نەك دجلە".

هەروەها هەمان قاموس دەنووسێت: "بابل، نێوی شەنعار و شوێنی نەمرود بووە، (نەمرود)ش کوڕی (گوش) بووەو گوشەکان هەفتاو چوار ساڵ حوکمڕانیان کردووە". هەروەها دەڵێت لە بابلدا پەرستگەیەکی بەنێوبانگ هەبووە بە نێوی (بیرس نەمرود).

کوردەکان بە سنجاری نزیکی موسڵ کە دانیشتوانی لە کۆنترین ڕۆژگارەوە لە ئێزیدییانی کورد بوونە، کوردەکان "شنغار"ی پێدەڵێن، (گوش) نێوی کوسییەکانەو ئەو هەفتاو چوار ساڵەی کە بە ماوەی حوکمڕانی گوشەکان دانراوە، دەبێ حەوت سەدو چل ساڵی بێ کە لە ڕاستیا لەگەڵ ماوەی حوکمڕانی کوسییەکان لە بابل دا تێك دەکاتەوە.

لەوەیە (ئەرك) لە ناوچەی (شنغار) بێ کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بابلەو کەوتووەتە سەر ڕەخی دیجلە. بە شوێنی نەمرود گوتراوە بابل و نەمرودیش بە کلدانی لە قەڵەم دراوەو ئیدی بەم بۆنەیەوە بە نەژادی سامی هاتوونەتە ناسین. لە حاڵێکا قاموسی پیرۆز بە خۆی (نەمرود) بە کوڕی (گوش) لە قەڵەم دەدا کە گوش ناوی کوسی، کاسیتەکانە. بەم پێیە دەبێ بگوترێ مێژوونووسانی سامی، پاشایانی کاسیت- کاردونیاش-یان، کە لە بابلدا حوکمڕانیان کردووەو بە جەمشید ناسراون، بە نەمرود زانیوەو بە نەژادی خۆیان زانیون. لە ڕاستیدا سەرچاوە مێژووییەکانی ئێرانیش لەسەر ئەو ڕایەن کە جەمشید ئیدیعای خوایەتی کردووە. خۆ بەپێی فەرمایشتی قورئانیش بێ، نێوی ئەو پاشایەی کە ئیدیعای خوایەتی کردووە، نەمرود بووەو ناوی وەزیرێکی نەمرود ئازەر بووە. یەکەم نەمرود و ئازەر وشەی ئارياییین، نەمرود بە مانای (نامرێ) و ئازەر بەمانای ئاگر بووە کە کوردێن ئەمڕۆش ئاگر بە هەمان مانای (ئازەر) بەکاردەهێنن. نێوی دایکی ئیبراهیم

درودی خـوای لەسـەر بـێ (ئوشـا) بـووە. (ئوشـا)ش لـەنێو هیندەکانـدا بـە خواوەندی سپێدەی بەیان گوتراوە کە بە ئاشقی هەتاو هاتووەتە ژماردن. لە ئاوێستاشدا (ئوشا) نێوی ئەو خوایەیە کە حـەزرەتی زەردەشـت لـە گاتاکانـدا نێوی بردووە. بۆ نموونە لە شوێنێك دا دەفەرمووێ.

١- دەست لە مەزدای خەڵقەنـدەی هـۆش پـان دەکەمـەوەو لێـی دەپارێمـەوە کە بەر لە هەموو شتێ داواکارم ئەی (ئوشا) کە (وهومن) و گیانبەخشی و هومن لە خۆڕازی بکەم.

٢- ئەی مەزدا ئاهوراو ئەی (ئوشا)و ئەی (وهومن) من ئـەو کەسـەم کـە لـە ئێوەو ئـەو کەسـانەی وڵاتـی نـەمری (ئـارمتی) دەپـارێزن دەپاڕێمـەوە و سوپاسگوزارم.

٣- ئەی مەزدا بەپێی بەڵێنی خۆم لەگەڵ وهومن و ئوشادا بەرەو زەردەشت هاتووم و پشتوو پشتیوانم بە، تا لە سایەی تۆدا بتوانم بەسـەر دژمنـانم دا زاڵ و سەرکووتوو بم.

نێوی ژنی ئیبراهیم (سارە) بووە، (سار)ش لە زمانی کوردیدا بە مانای سارد دێت.

لـە روونکردنـەوە مێژوویيـە کۆنەکانـدا وا دەردەکـەوێ کـەنێوی وەزیرەکـەی تری نەمرود (مەهان) بـووە، (مـەها، مـەهان) وشـەێن سانـسکریتین و واتـای گەورە بووە کە لە ئاوێستادا بووە بە مازا و لە کوردیدا بووە بە (مەزن).

هەندێ سەرچاوەی مێژوویی دەڵێن (ئازەر) بابی ئیبراهیم سڵاوی خـوای لـێ بـێ، نـەبووە. بـەڵکو مـامی بـووە. ئەگـەر ئەمـە راسـت بـێ، ئـەوا چـونکە کوردەکان بە مام دەڵێن (ئاپ- ap)، بۆیە لەگـەڵ (اب)ی عەرەبیـدا بـە هەڵـە تێکەڵ بوونـەو ئـەم ناوانـە بـە گـشتی وشـەی ئاریـایین و بـەم پێیـە نـەمرود

ومیللەتەکەشی بە زمانی ئاری قسەیان کردووەو لە ڕەگەز و ڕەسەنی ئاریایی بوونە.

قامووسی کتێبی پیرۆز لە تەوراتەوە، پیدایش ٢٥: ٣، ٤، دەنووسێت کە ئیسماعیلیەکان لە (مەدیان) بوونەو (مەدیان)ش بەوە دەزانن کە لە قەتورەی ژنی ئیبراهیم بوون.

کتێبی نێو براو، لەو نەخشەیەدا کە کراوەتە پاشکۆی، ئەو شوێنەی کە کەوتووەتە کەناری باکوری دەریای سوور بە دەستی ڕۆژهەڵاتی ئیلانپی دا (ئیلانپی: دەبێ مەبەست لە کەنداوی عەقەبە بێ) لە (المدیانین) نیشاندراوە، ئەویشیان وەکو (کوتی، کوسی و مادەکان) بە وەچەی حام نیشان داوە.

خۆ مادەکانیش لە شوێنی خۆیان (مەدیان) یان پێوتراوە لەم حاڵەتەدا دەبێ لە نێو پاشایانی ئارییەکاندا بۆ نەمرود بگەڕێین. هەرچەندە لە سەدە کۆنەکاندا دەسەڵاتداری و حوکمڕەوایی سامی نەژادەکان لە ناوچەی نەمرودەکاندا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەو دەسەڵاتو حوکمڕەواییانە زادەی لەشکرکێشی سامی نەژادەکان بووەو ئەوەندە دەوامیان نەبووە.

کلدانییەکان لە نەژادی جۆراو جۆر پێکهاتبوون کە سێ هەزار ساڵ پ.ز هەر یەکەیان پاشایەکیان هەبووەو هەر کە یەکێکیان دەسەڵاتێکی پتری پەیدا کردووە، خۆی بە پاشای چوار نکال داناوە. (بڕوانە: تاریخ ایران قدیم).

یەکێك لەو نەژادانە، گوتیە ئارییەکان بووە کە لە باکووری کلدەو لە بەشێکی بابلدا دەژیان. ئەو پاشایەش کە خۆی بە پاشای هەر چوار نکال داناوە ناوی (کاندش) بوو. ئەم پاشایە کوسی و ئاری نەژاد بووە کە لە بابل و میزوپۆتامیادا دەوڵەتی (کاردونیاش)ی دامەزراندبوو.

ئەنسکلوپیدیای یەهود سالّی (١٥٠٠: ٢٠٠٠پ.ز) بە سالّی لە دایکبوونی ئیبراهیم دادەنێ و پێی وایە (١٧٥ یا ١٩٥ سالّ) عومری کردووە. لەبەر ئەمە پێویستە لەو سەرو بەندەدا سۆراخی نەمرودەکان بکەین.

کاسیتەکان لە سەدەی هەژدەیەمی پ.ز، پەلاماری (بابل)یان داو پاشان گرتیان و بۆ ماوەی حەوت سەدە کردیان بە پایتەختی خۆیان و حوکمڕانیان تێدا کرد.

لەم سەدانەدا، میتانیەکان لە باکوری بابل دا حکومەتێکیان دامەزراند و بۆ ماوەیەکیش (بەنی ئیسرائیلی)یەکانیان خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیان. میتانیەکان لە کوسییەکان و لە جوملەی سوباریەکان بوونە. پاشایانی کاسیتەکان- کوسییەکان لە مێژووی ئێراندا بە تێکڕایی بە جەمشید ناسراون و هەر جەمشیدیش بوو کە خۆی لە پلەی خوایەتی دا بینیوەو کتێبی ڤیداو ئاوێستاش تاکیدیان لەسەر نەمری ئەو کردووە. تەورات ئیسماعیلییەکانی بە نەوەی (مەدیان) زانیوەو مادەکانیش لە کوسییەکان بوونە.

زەردەشتیەکان، ئیبراهیم بە زەردەشتی سێیەم دەزانن. بە باوەڕی ئەوان مەهاباد، زەردەشتی یەکەم بووە.

هوشنگ –ئیکیش هوش- زەردەشتی دووەم بووەو نێوی زەردەشتی سێیەم (ئابرام، ئاورامە) کە عەرەب کردوویانە بە ئیبراهیم. بەم پێیە بە باوەڕی پارسییان، ئیبراهیم دوا زەردەشتە کە لە سەردەمی کوسیەکاندا هاتووە.

ئەگەر تێك کردنەوەی کات و شوێنی:

١- ئیدیعای خوایەتی نەمرود فەرمایشتی قورئانی پیرۆز و ئیدیعای خوایەتی و نەمری جەمشید لەلایەك،

٢- هاتنی لەشکری مێشوولە لە قۆڵی ڕۆژهەڵاتەوە و کوشتنی نەمرود، و فەرمایشتی قورئانی پیرۆز و هێرش و پەلاماری عیلامیەکان لە قۆڵی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ سەر بابل و تاڵانکردنی، کە زانیاری مێژووییە... لەگەڵ ئەو شرۆڤە و زانیاریانەی لە قاموسی موقەدەسدا نووسراون لەلایەکی ترەوە لەبەر چاو بگیرێت دەشێت ئەوە قبوڵ بکرێ کە نەمرودەکان پاشایانی کاسیت، واتە زنجیرەی جەمشید بوونە.

خۆ ئەگەر بە پێچەوانەی ئەنسکلوپیدیای یەهود کە نەمرود بە کوڕی گوش واتا کوسی دەزانێ، نەمرود بەر لە سەردەمی کاسیتەکان هاتبێ ئەوا سێ هەزار ساڵ بەر لە زاین تیرەیەکی میللەتی گوتی بە نێوی سوبیر، سوبار و لە دەشتی نەمرودەکاندا حکومەتیان هەبووە. نایریەکان، ئەوەی ئەم سوبارییانە بوونە کە لە سەردەمی نارامسیندا پاشایەکیان هەبووە بە نێوی (پوتی مدال)و بە قەڵەمڕەوەکەیان گوتراوە نەمر، لە باسی نایرییەکاندا ئەوەمان سەلماند بوو کە (پوتی مدال) بە مانای خوای بچووك هاتووە. بەم پێیە لەگەڵ ئیدیعای خوایەتی نەمرودا تێك دەکاتەوەو قەڵەمڕەوەکەشی نەمر بووە کە دەگەڵ نەمرودا یەکێکە.

کێوێك لە کەناری باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان هەیەو نێو کێوی (نەمرۆ)یە. دەڵێن هاوینە هەوارو سەیرانگەی نەمرود بووە. ئەم ناوچەیە بەشێك بووە لە حکومەتی نەمرەکان.

شەرەفنامە کە بەشێکە لە مێژووی عەشایەری کوردو لە لایەن میر شەرەفخانی بەتلیسیەوە دانراوە، دەربارەی کێوی نەمرود دەڵێت:"قسەی باوی سەرزاری خەڵکی ئەوەیە کە نەمرود لە زستاندا بارگەی لە ئوجادا دەخست و هاوینان هەواری لەم کێوەدا بووەو لەسەر کێوەکە قەڵاو کۆشك و

سەرای پاشایانەی رۆناوەو زۆربەی کاتی لەوێنـدەر بەسـەر بـردووە، کـە خـوا غەزەبی لێگرت لە کێوەکەوە سەرنگوون بـووەو بـە جۆرێ رۆچـووەتە زەوی کە لە جێی قەڵاو کۆشك ئاو هەڵقوڵاوە، وێڕای ئەوەی کە کێوەکە دوو هەزار گەز لە زەوییەوە بەرزەو بە مەزەندە لە بەرزی هەزارو پێـنج سـەد گـەز، لـە ناوەندی کێوە رۆچووەکەدا دەریاچـەیەکی گـەورە پەیـدا بـووە کـە تیرەکـەی پێنج هەزار گەزو بگرە زیاتریشە".

هــەر چــەندە دیــاریکردنی بنجبڕانــەی کەســایەتی نــەمرود و ســەردەمی حوکمڕانیەکەی سەرەڕای ئەو ئیدیعایـەی کـە ئیبراهیم زەردەشـت بـووە، بـۆ ئێمە زەحمەت و ئەستەمە، بەڵام بـەپێی شوێن و نێـوی نـەمرودەکان دەبـێ ئـەو قبـوڵ بکـرێ کـە نـەمرودو میللەتەکـەی تیرەیـەك بـووە لـە هۆزەکـانی (کوتی، کوسی -کورد- و لە نەژادی ئاریان بووە).

لەم حاڵەدا دەبێ بڵێین:

ئیــبراهیم، لەبــەر بــاوەڕی یەکتاپەرســتی خــۆی، لــە پاشــای وەخــت جیــا بووەتــەوەو بــۆ عەرەبــستان کۆچــی کــردووەو بارگــەی لەوێنــدەر خــستووەو خــەریکی بڵاوکردنــەوەی ئــاینی یەکتاپەرســتی خــۆی بــووەو ئیــدی نــەوە و پاشـینانەکانی لـە ئـەنجامی دوور کەوتنـەوەیان لـە کۆمەڵگـەی هـاو نـەژادی خۆیان، بە تەواوەتی بوونەتە عەرەب و هەر لەبەر ئەمەشە کـە نـەمرودیش بـە سـامی نـەژاد لـە قەڵـەم دراوەو قورئـانی پیرۆزیـش ئـەم بۆچـوونەی بـەم ئایەتەی خوارەوە سەلماندووە: (مـا کـان ابـراهیم یهـودا) لـەم ئایەتـەوە ئـەوە بەدیار دەکەوێ کە ئیبراهیم لـە یـەهود، وات لـە نـەژادی سـامی نـەبووە، بـاو باپیرانی یەهودەکان باوەڕیان بـە ئیـبراهیم هێنـاوە. تەنانـەت پێغەمبـەریش (محەمــەد) درودی خــوای لــێ بــێ کــە لــە نــەوەی حــەزرەتی ئیبراهیمــە

فەرموویەتی: "العرب منی وانا لست من الاعراب" واتە عارەب لە منن، و من لە عارەبان نیم.

تەنانەت ڕیوایەتێك هەیە کە پێغەمبەری مەزن فەرموویەتی: "پاش من خەلیفە لە قورەیش بێتە هەڵبژاردن، گەر لە نێو قورەیشدا کەسێکی شایستە پەیدا نەبوو، ئەوا لە قەحتانەکان هەڵبژێردرێت، خۆ ئەگەر لە ناو قەحتانەکان پەیدا نەبوو، ئەوا لە نێو عەجەماندا بگەڕێن". لێرەدا ئاماژەی بۆ ڕەگو ڕەچەڵەکی خۆی فەرمووە.

((٥))

## پوختەی نێوەڕۆکی کتێبەکە

لە کۆنترین قۆناغەکانی مێژوودا، قەومێك بە نێوی گوتی، گوتو، لە ناوچەی قەفقازو شوشدا ژیاون و ناوچە شاخاوییەکانی نێوان رۆژهەڵاتی ئێران و ئاتنەیان داگیرکردووە. سەروەختێکیش قەڵەمڕەوی سۆمەرییەکانیان داگیر کردووە. ئەوەی لە ئاسەوارە دۆزراوەکانەوە بە دیار دەکەوێ ئەوەیە کە پاشای ئەو قەومە (ئانناتوم) بووەو لە سەدەی سی و یەکەمی پ.ز دەگەڵ دەوڵەتی عیلامدا بەشەڕ هاتووەو مەرکەزو مەڵبەندەکەی (زی کویە) بووە. لە سەدەی بیست و نۆیەمی پ.ز (لوکال زاکیس)ی پاشای گۆتی، پاشای ئەرخ و سومەریش بووە.

گۆڤاری (ایران کوده) دەنووسێت: "هوکسسەکان کە نزیکەی پێنج سەدە لە میسردا فەرمانڕەواییان کردووە، ناسەوار و شوێنەواری پاشاکانیان لە دوڕگەی کریتەوە تا دەورویەری بەغدا بەرچاو کەوتووەو شۆرەت و مێژووبانگی ئەم پاشایانەی گەیاندووەتە ئەو شوێنە دوورانە.

پاش مشتومڕ و گەنگەشەیەکی چەندین ساڵە لەسەر نەژادی ئەم میللەتە، ئەو ئەنجامە بە دەست هاتووە کە ئەمانەش لە نەژادی ختی (واتە گوتیان، مادیان) بوونە. رەنگە هوکسس، وشەیەکی پارسی کۆن بێ و بچێتەوە سەر (هوخشتر- هوخشیش) کە واتای شارداری چاك یان ئیمپراتۆر بووە، ئەمەش لەقەبی پاشایانی ئێران بووە.

ئەم میللەتە تا سەردەمی ئێستاشم چ هەڵکشان و داکشان و دابەش بوونێکیان بەسەر هاتووە، ئەمە نهێنییەکە و هێشتا لە ژێر خاکدایە.

حەزرەتی نوح کە بە قسەی سۆمەرییەکان ناوی شوێنەکەی (پاتز)ی بووەو نێوی ئەسڵی خۆی (زیوکیدە)ە، جا چونکە وشەی (پاتزی) وشەیەکی کاسییەو (زی کویە) نێوی مەرکەزو مەڵبەندی گوتیەکانە، کەواتە نوح سەرۆك و پێغەمبەری ئەم قەومە بووە. کۆبنکاریە زانستییەکان کە بەپێی توانا لاپەڕەی چاخەکانی مێژووی بۆ کردوینەتەوە ئەم درەختە کۆنە بەلقە جۆراوجۆرو فرەکانییەوە نیشان دەدا.

یەك لە دیارترین و بەرجەستەترین لقەکانی، قەومی لولوبییەکان بووەو لقێکی تری سوبیرەکان بووە، یەکەمیان لە ناوچەی شارەزوور، کرماشان فەرمانڕەوایی کردووەو دووەم لە باکووری شووشەوە تا ئاتنە سەربەخۆیانە حوکمڕانی کردووە.

(شەڕلك)ی پاشای گوتی کە بە (سیامك)ی شانامەمان دانا، ڕەنگە لە سوباریەکان بووبێ، کە هێرشی بۆ بابل (٢٧١١- ٢٦٨٨ پ.ز) کردووە، لە شەڕی (شارکالی شاری)ی نەوەی (نارامسین)ی پاشای ئەکەدا (بەقسەی شانامە بە دەستی دێوان) کوژراوە.

(ئیکش هوش) پاشای گوتی، لە سەرچاوە مێژوویییە کۆنەکاندا بە هوشەنگ تۆمار کراوە. (ئانری داپزیر)ی پاشای گوتی —تەهمورپی شانامە- دژمنانی خۆی سەرکوت کردووەو سنووری حوکمڕانیەکەی خۆی لە رادەبەدەر فراوان کردووەو کەوشەنی نارامسینی گرتووە —بە قەولی شانامە دێوەکانی گرت و حەپسی کردن- هەموو ئێران، ئیلامی سۆمەر، ئەکەد، بابل و دەفەرەکانی سەرووی دیجلەو فورات و ئاتنەو لەوەیە ناوچەی قورو (چوروخ)ش لە چوارچێوەی حوکمڕانی (ئانری داپزیر) بووە.

چل و یەك پاشای گوتی، سەدو بیست و پێنج ساڵ و چل رۆژ لە بابل دا حوکمڕانیان کردووە. پاشان (نوتون لوگال)ی پاشای ئەرخ کە بە نێوەکەیدا دەبێ لە نەژادی گوتی بوو بێ، (تیریکان)ی شاهنشای خۆی کە پاشای گوتی بووە، شکاندو شیرازەی هۆزەکانی گۆتی پچڕاو سیستەمی خان خانەکێ هاتە ئاراوەو لە باکووری رۆژهەڵاتی عیلامدا، ویلایەتێك بە نێوی ئەنزان، ئەنشان جیا بووەوە. لە کۆجارەکانی بەختیاریدا میرێك بە نێوی (گیر) جیا بووەوە. ئەوانەش کە لە ناوچەکانی جودی و بەتلیس بوونە، نێوو نازناوی (کاردا- کارداکا) یان گرتەخۆ کە کاردا لە زوانی ئەکەدی و سۆمەرییەکاندا، بە مانای قارەمان، جەنگاوەرو پاڵەوان بووە. کارداکان بە گوێرەی هەڵکەوتی جوگرافیاییان، دەبێ لە سوباریەکان بووبن. نایریییەکان کە لقێکن لە

کارداکان بە سوبیری ناسرا بوونە. سەر زەمانێ هەموو کوردستانی باکووریان گرتبوو.

(تورو دانژین)ی رۆژهەلاتناسیش لە کۆمەڵەی ئاشورولۆژیدا دەنووسێت لە ساڵی دوو هەزاری پ.زدا خەڵکی (سو) لە نیشتمانی کارداکاندا بوونە، کە لە باشوری دەریاچەی واندا ژیاون.

ئارامیەکان بە ناوچەی جودییان گوتووە کازارتا- کاردو، پاش ئەو سەردەمە، مێژوو رووداوەکانی لەمەڕ گوتی-جودییەکان تا رادەیەك ئاشکراتر نیشان دەدات.

بەشی هەرە زۆری گوتیەکان (کوپی- گوش)یان پێوتراوە. کاسیتەکان یەکێکن لە تیرەکانی (کوپی) کە هاوشێوەی وشەی کازارتایە. لە ساڵی دوو هەزاری پێش زایندا لە کێوەکانی رۆژاوای دەریای خەزەرەوە بەرەو باشوور کۆچیان کردووەو گەییونەتە لورستان، دەگەڵ کوسیانی ئەوێدا پەلاماری بابل-یان داوە. (کاندش)ی پاشایان لە ساڵی (١٧٦٠پ.ز) دەوڵەتی بابلی لە نێو بردو نێوی پاشای چوارنکالی لە خۆ ناو دەوڵەتێکی بە نێوی (کاردونیاش) دامەزراند. لە راستیدا دەوڵەتی مەزنی گوتی زندوو کردەوە. (ئاگوم کاکریم)ی ولاتگیری کوسی، کەموکوڕییەکانی ئەم دەوڵەتەی تەواو کرد. (ئاگوم کاکریم) یەکێك بوو لە ولاتگیرانی کوسی.

لەو سەردەمەدا، ماڵباتێکی کوسی کە نێوی خۆیان لە نێوی خوایەکەی خۆیانەوە، میترا، وەرگرتبوو لە باکووری سوریادا دەوڵەتی میتانیان دامەزراند. ئەم دەوڵەتە بووە کۆسپێکی گەورە لە بەردەم میسریەکاندا، و بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەنی ئیسرائیلیان خستبووە ژێر دەسەلاتی خۆیان و

دەستیان بەسەر ئاشورستانیشدا گرت و سنووری فەرمانڕەوایی خۆیان فراوان کردەوەو گەیاندیانە کەرکووك.

هەندێ جار پاشای وڵاتی ئاشور لە قەومی گوتی و لولو بوونە، لە بنەڕەتدا دانیشتوانی ئەسڵی ئاشورستان گوتییەکان بوونە. ئاشوریەکان لە سەردەمی حوکمڕانی کاسیتەکان لە بابل دا، لە ناوچەی نەینەوا سەریان هەڵداوە.

دەشێت دەوڵەتی ئاشور بە دەوڵەتی هاوبەشی ئاشور-کاردا بزانرێ. دەوڵەتی کوسی لە ساڵی ١١٧١پ.ز، بە دەستی پاشای عیلام لە بەین چوو. ئەم زنجیرەیەی کوسی –کاسیت کە نزیکەی حەوتسەد ساڵ لە بابلدا فەرمانڕەواییان کردووە لە مێژووانی کۆنی ئێراندا بە جەمشید ناسراون.

لەگینە لەلایەکەوە میتەکان- کاسیتەکان بووبن و لە لایەکی ترەوە نەمر – نایرییەکان بووبن کە لە قورئانی پیرۆزدا بە نەمرود ناوبراون. ئەم میللەتە شکۆدارە جگە لە نوح، (ئەورام- ئیبراهیم)شی بە جیهان بەخشیوەو محەمەدی مایەی شانازی عەرەب و عەجەم لە نەوەی ئەوە، واتە لە نەوەی ئیبراهیمە.

هۆزی موشکی لە ساڵی (١١٠٠ پ.ز) دەوڵەتێکیان دامەزراند، هەموو کوردستانی باکووریان گرت، دەسەڵاتیان بەسەر قبادوکیەو کلیکیاشدا گرت. یەکێك لە تیرە گوتییەکان بە نێوی خالدی-ئارارات لە باکووری کارداکیەدا ناوبانگیان پەیدا کردو (ساردوریس) پاشایان (٧٨٣- ٧٧٣ پ.ز) سەلمان نەسری سێیەمی پاشای ئاشووری شکاند. (منواش)ی پاشای ئاراراتیش کە دەبێ (مەنوچەهری) شانامە یا (منواش چترا)ی ئاوێستا بێ، نێوو نێوبانگێکی شایستەی هەبوو و ناوچەکانی پارسواو مانائی لە دەستی ئاشووریەکان دەرهێنا.

بــه گــوێرەی نووســراوەکانی (توکــولتی ئینورتــا)، پاشــای ئاشــور، بۆمــان دەردەکەوێ کە نێوی گوتی بووە بـە (کـورتی)، کورتی گـەورەترین تـیرەی گوتی بووەو لە نێو هەموو هۆزو ناوچەکانی گوتی دا هەبوونەو کاریگـەریش بوونە. بەشێك لـە کورتیـەکانی رۆژهـەڵاتی ئێـران کـە هەنـدێ مێـژوونووس (سیرتی)یان پێگوتوون بەرەو رۆژاوا هاتوون و تێکـەڵاوی کورتیـەکانی رۆژاوا بوون. تامێژوو پتر روون بووەتەوە، نێوی جۆراوجۆری گوتییەکان ئاشـکراتر بـووە لەوانـە هـۆزی پاراسـواو ماننایـیەکان بوونـە کـە یـەکێکیان لـە رۆژاواو ئەویتریان لە باشوری دەریاچەی رەزاییە ئاکنجی بوونە.

پارپواکـان، پـارت، پەهلـەوی بوونــە کـە پاشـان بـەرەو رۆژهـەڵات کۆچـیان کردووە. داریوشی گەورە پێی گوتـوون (پەرسـو)، ماننایـیەکانیش بـە تێپـەڕ بوونی رۆژگار بوونە بە مانی، مانژ، ماژ، کورماژ، کورمانـج.

زۆربـەی پاشایانی تیرەکـانی زاگـرۆس لـە ماڵباتـانی سـەرانی ماننـایی بـوون. (ایرانزو) و (ئازا) دوو پاشای ماننایی بوونـە کـە لـە شـانامەدا بـە (زو- زاب) ناو براون. "دیـاکو- دیجوس" کـە کـوڕی سـەرۆکی ماننـایی کـە بـە لەشـکری ئارارات هێرشی کردە سەر باشور، بـە دەسـتی پاشـای ئاشـور گـیراو بـۆ سـوریا دوور خرایەوە ، لە رێگەی میتانەکانەوە- مادەکانی بـاکوری سـوریا- هـەڵات و هاتــەوە نێـو میللــەت، دەوڵـەتی مـادی دامەزرانـدو لـە ساڵی ٧٠٥ پ.ز لەسـەر تەختی ماد دانیشت- بەقسەی شانامە زاڵ، رۆستەمی نارد، کەیقوبادی هێنـاو میللەت بە تێکڕای دەنگ ئەویان کرد بە پاشا. لەوەیە میللەت (کاك ماد)یـان پێگـوتبێ و پاشـان بـووە بـە (کـەیقوباد) هـەر چـەند نێـوی ئـەم پاشـایە لـە ئاوێستادا (کوات) بووە کە بـە تێپـەڕبوونی رۆژگـار بـووە بـە قوبـاد، چونکە

وشەی (دیاکو) بە بەرەواژی دەبێتە (کوایـد)، دەتوانین بڵێین وشەی (کەیقوباد)ش لە ئەنجامی ئاوەژوو خوێندنەوەی (دیاکۆ)وە هاتووە.

(فەروەرتیش) پاشای ماد، لە ساڵی (٦٥٠ پ.ز)دا ناوچەی ئەنزانی گرت و ناوچەی (پارس)شی خستە سەر وڵاتەکەی خۆی و بە گوتەی هیرودوت هەموو ئێرانی فەتح کرد. ئەم پاشایە بە هەڵە لەگەڵ (ترەئتویون)ی ئاوێستادا تێکەڵ کراوەو پێیان گوتووە فەرەیدوون، و سەردەمی حوکمڕانیەکەشی لەم هەڵەو تێکەڵکردنە نەخەلەسیوە، واتە لە بری ئەوەی بە کوڕی کەیقوباد دابنرێت، بە بابی ئیرەج دانراوە. کوڕەکەی، هوخشتر کە لە ساڵی (٦٦٣ پ.ز) بووە بە شاهنشا، هەموو سەرانی (کمیری و سکایەکانی) کە لە سەردەمی بابیدا هاتبوونە ناوچەی مادو بۆ ماوەی بیست و هەشت ساڵان لە مادستاندا ئاژاوەیان گێڕاوەو ئەمن و ئاسایشیان تێکداوە، لە یەك شەودا کوشتن و وڵاتی لە شەڕیان رزگار کرد.

زۆر نزیکە ئەو جەژنی (تول هەلدان) واتە (تۆڵە سەندن)ەی کە هۆزی کورمانج گوایە بەبۆنەی کوشتنی زوحاك بە دەستی فەرەیدوون، دەیگێڕن، پەیوەست بێ بە کەیف و شادی کوشتنی سەرانی ئەم تیرە تالانکەرو شەڕانیانە بە دەستی هوخشترە.

(هوخشترە) لە ساڵی ٦١٢ پ.ز لەگەڵ دەوڵەتی بابلدا، یەکی گرت و دەوڵەتی ئاشووری لە نێو برد. لە کاتی شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی لیدیەدا رۆژ دەگیرێت، و ئەمە بە دیاردەی غەزەبی خوا دێتە ژماردن و سوڵح دەکەن. قزل ئیرمەق-روباری هالیس، لە ناوچەی سیواس دەکەن بە سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت.

هوخشتر له نێوی چالاکی ولاتگیریی کوسییەکانی بوژاندەوەو سەروەری و فەرمانڕەوایی ئارییەکانی، کە چەند سەدەیەك بوو کەوتبووە دەستی کوڕانی سام، بۆ ئاری نەژادەکان گێڕایەوە. کەوشەنی مادی لە قزیل ئیرمەقەوە تا بەلخ و لە دەریای خەزەرەوە تا پارس و خۆزستان فراوان کردووە.

(ئیختو ویکو)ی کوڕی هوخشتر، بە داخەوە لیاقەتی پاراستنی ئەم ئیمپراتۆریەتەی نەبوو، میللەتی لە خۆی رەنجاندو (کوروش) پاشای ئەنزان کە نەوەی کچی (ئیختو ویکو) بوو یاخی بوو و میران و وەزیرانی (ئیختو و ویکو) دایانە پاڵ (کوروش) و (ئیختوو ویکو)یان گرت و تەسلیمی (کوروش)یان کرد، کوروشی هەخامەنشی بوو بە شاهنشا (٥٥٠ پ.ز).

دوا پاشای کوسی نێوی (ئانلیل – نادین- ئاخە) بوو. لەوەیە ئاخەمەنیش لە نەوەی هەمان ئاخە بووبن کە لە قەومی کوسی- گوتی بووە. لە بنەڕەتدا هەخامەنشی پاشای ئەنزان، یانی ئەنزانی بووە کە دانیشتوانی ئەنزان تێکڕا کوسی و گوتی بوونە. کەتیبەو بەردەنووسی مالامیرو ئەشکەوتی سلیمان کە بە خەتی بزماری هەیە، لە پاش (تخی خی گوتو ئاماردی) پاشای ئەنزان بەجێماوە، ئەوە دەگەیەنێ کە خەڵکی ناوچەکە بریتی بوونە لە گوتوکان و ئاماردییەکان کە یەك تیرەی کورد بوونە.

نزیکەی شەش سەد ساڵ پ.ز، ئەرمەنیەکان خاکی ئاراراتییەکانیان گرتووەو هاڵدییەکانیان کردووە بە باجگوزاری خۆیان.

زاگرۆتییەکان، یەکێك بوونە لە رەشیدترین تیرەی کورتی، ئەم زاگروتیانە، (ساکارتی) شیان پێوتراوە کە ساکارتا، زاکارتا لەگەڵ کازارتادا دەبنە ئاوەڵژووی یەکدی، کە ئەم ساکارتیانە لەو (سیرتی Cyrti و کورتی)یانەن کە لە رۆژهەڵاتی ئێراندا ژیاون. کەی هاتوونەتە کۆسارەکانی زاگرۆس؟ ئەمە

بـە تـەواوەتی دیـار نییـە. ئەمانـە لـە داوێـنی ڕۆژئـاوای زاگـرۆس و لـە دەوروبـەری هـەولێر نیـشتەجێ بوونـە، ناویـان بەسـەر کێوەکانی زاگرۆسـدا بڕاوەو زاگرۆس – زاگروت ناوەکانیان لە یەکترەوە وەرگرتووە.

(چتر تخمە)ی سەرۆکی ئەم عێڵە لە سەردەمی داریوشدا یاخی بوو، خۆی بە نـەوەی هوخـشتر لـە قەڵـەم دا، ویـستی تـەخت و تـاجی لـە دەسـت چـووی وەربگرێتەوە، لێ گیراو کوژرا. یـەکێکی دیکەشـیان کـە نێـوی (فـەروەرتیش) بوو ئەویش خۆی بە نەوەی هوخشتر لە قەڵەم دا و بەشێك لـە مادەکـان بـە پاشـای خۆیانیـان هەڵبـژارد. فـەروەرتیش زۆر شـەڕی دلێرانـەی کـردو سەردارانی داریوشی، کە یەکێکیان ئەرمەنی بوو، یەك لە دوای یـەك شـکاند، داریوش بە خۆی هاتە شەڕی فەروەرتیش. فـەروەرتیش هـەڵات بـۆ (ڕەی) و لەوێندەر گرتیـان، هێنایانـە هەمـەدان و لـەوێ لـە قـەنارەیان دا. ئەمانـە بـە ئیـدیعای خۆیـان لـە شـازادەکانی مـاد بـوون و لـە ڕای وەرگرتنـەوەی مـافی حوکمڕانی و فەرمانڕەواییماڵباتەکەی خۆیاندا هاتنە کوشتن.

لە سەردەمی سەردارانی ئەسکەندەردا، پارتەکان بە نێوی پەهلەوی سـەریان قوتکردەوەو دەسەڵاتی نەتەوەیی خۆیان وەرگرتەوەو بـۆ مـاوەی پێـنج سـەد ساڵ لە وڵاتانی زۆر بـەرین و فراوانـدا حوکمڕانیـان کـرد. پاشـان (ئەردەشـیر بابك) کە لە کوردانی فارس نشین و لە ئێڵی شوانکارە بوو، جڵەوی ڕاپەڕینی شاهنشایی لـە دەسـتی (ئـەردەوان)ی ئەشـکانی وەرگـرت و دەوڵـەتی بەشـکۆی ساسانیانی دامەزراند. پێدەچێت ئەم ئێڵـی شـوانکارەیە، (پاسـارکاد) بـوو بـێ کە بووە بە (پاساکار، ساپاکار، ساپانکار و شوانکارە) کە لە کوردەواریدا وەکـو ئێڵێك هاتووەتە ناسین.

له ئاخرو ئۆخری دەسەڵاتی ساسانیان و سەرەتاکانی ئیسلام دا، عارەبەکان پەیوەندی زیاتریان لەگەڵ ئێرانیەکان پەیدا کرد، تیرە کوردە فارس نشینەکان و هەموو تیرەکانی (گوتی، کوسی، ماد) یان بە نێوی گشتی ئەمرۆکەی خۆیان، واتە کوردان ناو بردووە.

وشەی ماد چون گۆڕاوەو چۆن بووە بە وشەی کورد، هێشتا بە تەواوی و بە شێوەیەکی بنجبڕ خۆیا نیە. لەم بارەیەوە سێ ئەگەر دێتە بەرچاو:

١- لە سەردەمی ساسانیاندا بە خەڵك و لەشکریان گوتووە (کارا). بە خەڵك و لەشکری ماد گوتراوە (کاراماد)، ئیدی وشەی (کارا) بە تێپەڕبوونی رۆژگار لەگەڵ وشەی کوڕ، واتە منداڵی نێرینە، تێکەڵ بووەو بووەتە (کوڕ مەد). (کوڕمەد)ش لەگەڵ وشەی (کورتی، زاگروتی، کاردو، کوسی)دا واتە نێوی هەموو هاونەژادەکان تێکەڵ بووەو بووەتە (کورد) و بە هەموو ئەو هۆزو تیرانە گوتراوە کورد.

٢- کورتییەکان، لە مادستاندا، زۆرینەی بێ هەڤرك بوونەو لە هەموو شوێنێکی مادستاندا هەبوونەو لەلایەن عارەبەکانەوە لەگەڵ هەموو تیرەو هۆزەکانی دیدا تێکڕا بە کورد ناوبراون.

٣- لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، عارەبەکان سەرەتا لەگەڵ تیرەکانی کورتی، کاردا، زاگروتییەکاندا پەیوەندییان پەیدا کردووە. ئێرانییەکانیش بە جەنگاوەر و پاڵەوانیان گوتووە (گورد). ئەو تیرەو هۆزانەش کە پاڵەوانیان تێدا هەڵکەوتووەو داوای دوئیلیان کردووە، هەمیشە وشەی (گورد)یان کردووە بە پاشبەندی نێوی خۆ (.....گورد)

لە راستیا ئەم میللەتە جەنگاوەرترین و قارەمانترین خەڵکانێ بوونە کە عارەبەکان تووشیان بوونە. ئیدی سەبارەت بەوەی کە هەم لەقەبی (گورد)

کە پڕ بە پێستی هەڵس و کەوتیان بووەو هەم سەبارەت بە نزیکی وشەی (گورد) لە نێوی ئەو هۆزو تیرانەوە کە نێومان بردن، عارەبەکان بە هەموویان گوتوون کورد. ئیدی تیرەو تایفەکانی تری ئەم میللەتەش هەر بە هەمان ناوەوە هاتوونەتە ناسین. لە سەردەمی ساسانیەکاندا وشەی (ماد) بووە بە (مای) و لە سەردەمی عارەبەکاندا وشەی (مای) بووە بە (ماه).

بەم پێیە بۆ نووسینی مێژووی کورد، پێویستە مێژووی ئەم دەوڵەتانە (گوتی: سوباری، لولو، کوسی، میتانی، نایری، مشوکی، خالدی، ماننائی، ماد کە ئەژدادی میللەتی کورد ئەوان دایانمەزراند بوو لە یەك شوێندا کۆ بکرێتەوە و بنووسرێت.

لە ئەنجامدا دەبێ بگوترێ مێژووی کوردی وێڕای ئەو دەسەلاتەی کە لە کوردستانی تورکیای ئەمڕۆدا هەیان بووە، بریتییە لە مێژووی ئێرانی کۆن و لە هەموو قارەمانێتی و شانازییەکانی ئێرانی کۆندا بەشدارن.

* * *

لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز پەی بە جوامێری و مێرخازی و ورە بەرزی ئەم میللەتە ڕەشیدو قارەمانە بەرن، لێرەدا دوو نموونە دەخەمە بەرچاو، یەکەمیان دەربارەی کەسایەتی یەکەمی کوردە پاش ئیسلام، دووەمیان دەربارەی ژنێکی هەژارو داماوی کوردی سەردەمی تازەیە.

١- شا سەلاحەدینی ئەیوبی بە ناڤودەنگ کە مایەی شانازی هەموو موسوڵمانانی جیهانیشە، لە میللەتی کورد بووە.سوڵتانی میسر، حیجاز، سوریا بووە. لە شەڕی خاچپەرستەکانا، فەرماندەی گشتی هێزی خاچپەرستان، (ریچارد شێردڵ)، پاشای ئینگلستان بوو، لە شەڕی (عەرسوف)دا سەلاحەدین و (الملك العادل)ی برای. لەسەر گردێك دەوەستن،

لەوێندەرەوە چاودێری و سەرپەرشتی جەنگەکە دەکەن. ئەو ڕۆژە ریچارد بە خۆی هاتبووە شەڕ، ئەسپەکەی پێکراو کەوت، ریچارد بە پای پیادە درێژەی بەشەڕ داوەو بە قارەمانیەتیەکی بێ وێنە بەرگری لە خۆی دەکات. سەلاحەدین و براکەی لای خۆیانەوە ستایشی ئەو قارەمانێتییە دەکەن، و بە ڕەوای نازانن کە ئەم قارەمانە، هەر چەند گەورەترین دژمنیان بوو، لەبەر بێ ئەسپی بشکێ و تیا بچێت!.. ئیدی دوو ئەسپی ڕەسەنی عارەبی بۆ دەنێرن.

لەم کاتەدا یەکێك لە ئەفسەرانی زێرڤانی الملك العادل، بە دەنگی بەرز فەرمان دەدات: وەرنە دواوە، لە پاشای عیساییەکان دوور بکەونەوە!.

ئەم ئەفسەرە کە هەوساری جووتێ ئەسپی ڕەسەنی بە دەستەوە دەبێ، لە ریچارد نزیك دەبێتەوە، سڵاوی لێدەکات و دەڵێت:

ئەی پاشای خاچپەرستان! مەزنی من سەلاحەدین و (الملك العادل)ی برای بە چاوی ڕێزەوە دەڕواننە ئازایەتی و قارەمانیەتی تۆ، سڵاویان هەبوو، گوتیان قارەمانێکی وەکو خودان شکۆتان حەیفە بە پای پیادە شەڕ بکات، ئەم جووتە ئەسپە ڕەسەنەیان بۆ تۆ ناردووە، (تارك) دیاریی سوڵتانەو (مارك) دیاریی (الملك العادل)ـە.

ریچارد کە ئەم جوامێرییەی بینی زاری چووە کلیلە، پاش ماوەیەك بێدەنگی گوتی: بگەڕێوە بۆ لای سوڵتانی خۆت، سڵاوو سوپاسی منی پێ بگەیەنە، بڵێ ریچارد لە هەموو شوێنێك و بە دەنگی بەرز دەڵێت: "لە سەرکەوتنی جەنگی عەرسوفدا خۆی بە قەرزارباری پیاوەتی و بەخشندەیی و گەورەیی ئێوەی جووتە برا. دەزانێ!. (ئەمەم لە گۆڤارێکدا

خوێندووەتەوە، مەخابن نێوی نووسەرەکەیم لەبیر نەماوە، پێم وایە دەبێ یەکێك لە ڕێزداران کورد بچە یا هەمزە سەرداور و یاپسیان بێ).

٢- لە جەنگی ئازادیخوازی کوردان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا، لە ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٠ کە مەڵبەندەکەی لە ئارارات بوو، و بە فەرماندەیی نووسەر بوو. ئەگەر پێشمەرگە و خەباتکارێکی کورد بەر دەستی سوپای تورك کەوتبوایە یا سەریان دەبڕی یان بە دەم جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەوە دەیانکوشت، لە زستانی ساڵی ١٩٢٩دا لە شەڕێکدا کە لە ناوچەی ئورتولو ڕوویدا، تورکەکان شکان، ئەو سەربازە تورکانەی کە لەلایەن کوردەکانەوە گیرا بوون، لەبەر کەمی ئازووقە لە ئاراراتەوە ڕەوانەی خاکی ئێران دەکران. کوردەکان نەك هەر نانی دەمی خۆو منداڵەکانیان دەدا بە یەخسیرانی تورك، بەڵکو (هوریك) ناوێك کە بێوەژنێکی هەژارو بێ دەرەتان بوو، لە تیرەی حەسە سوریی جەلالی بوو کە بینی بووی گۆرەوی یەکێك لە یەخسیرەکان زۆر دڕاوە، گۆرەوییەکانی پێی خۆی داکەند بوو و کردبوویە پێی ئەو یەخسیرە تا لە ڕێگەدا پێی سەرمای نەبێ، بێوەژنەکە خۆی لەو سەرمایەدا بەپێی پەتی مابووەوە. هەر چەند ئەم ژنە پاشان لە چاکەی ئەو کارە مرۆڤدۆستانەیدا، کە نیشانەی گەورەیی روح و مرۆڤدۆستی میللەتی نەجیبی کورد بوو، پاداشتی خۆی وەرگرت.

کۆتایی

سەرچاوەکان:

١- شانامەی فیردەوسی
٢- تاریخ ایران باستان، مشیر الدوله
٣- تاریخ قدیم ایران، میرزا عباسخان اقبال
٤- کتاب مزدیسنا پشتها، پورداود
٥- گاتاها، پورداود
٦- تاریخ کردو کردستان، امین زکی بگ
٧- مێژووی ئەدەبی کوردی، علا الدین سجادی
٨- تاریخ بختیاری، سردار اسعد
٩- روچه الصفا،
١٠- مجمل التواریخ
١١- کردو پیوستگی نژادی و تاریخی او، رشید یاسمی
١٢- ایران نامه یا کارنامه ءایرانیان در عهد اشکانیان، عباس محمد علی شوشتری.
١٣- تاریخ سیرجان مالکولم
١٤- شەرەفنامە، امیر شرفخان بتلیسی
١٥- کتاب کرد، شمیم همدانی
١٦- نوروز نامه، عومر خیام
١٧- اسکندرنامە، ئارستوفلس
١٨- مجله ایران کوده.

**تێبینی:**

**ئەم کتێبەم لە ساڵی ١٩٨٨دا لە شاری سەقز، وەرگێراو یەکەمجار لە گۆڤاری کەلتور، ژمارە چوار، بەرپەڕێن (٣٠٧- ٣٨٠)دا بڵاوبووەتەوە کە مەخابن نەك هەر هەڵەی چاپی زۆری تیایە، بەڵکو لێرەو لەوێ دەستەواژەو رستەش پەڕیوە.. پاشان لە ساڵی ١٩٩٨دا، بۆ جاری دووەم بە کتێب، لەلایەن ناوەندی رۆشنبیریی یەکگرتووەوە، وەکو ژمارە (٢٦)ی پرۆژەی سەت کتێبی کوردی، چاپ و بڵاوکرایەوە، کە بەداخەوە نەك هەر هەڵەی زۆری تیا بوو، بەڵکو لە زۆر شوێندا رستەو دەستەواژەو پەرەگرافی بچووك پەڕی بوو، تەنانەت لاپەڕان پاش و پێش کەوتبوو، کە مامۆستا وریا قانع لە ژمارە پەنجای گۆڤاری رامانـدا وتارێکی لەسەر ئەو کەموکوڕیانە نووسی بوو و بەندە لە ژمارە پەنجاو یەکی هەمان گۆڤاردا وەڵامم دابووەوە..**

**جا خوێنەری بەڕێز ئەمەی ئێستا لە بەردەستدایە، دەکاتە چاپی سێیەم، کە هەم بژار کراوە هەم پێشەکییەکەی بۆ زیاد کراوەو لەم سەرچاوەیەی خوارەوە، کراوە بە کوردی، کە بە راستی چاپێکی یەجگار بێ سەروبەرو خراپە، بە تایبەتی لە رووی خاڵبەندییەوە، هیچ بایەخێکی پێنەدراوە.**

**حەمە کەریم عارف**

**٢٠٠٨ سلێمانی**

**سەرچاوە:**

**نام کتاب: تاریخ ریشه نژادی کرد**

**نویسنده: احسان نوری پاشا**

**ناشر: کتاب فروشی بزرگ سیدیان**

**تیراژ: (٤٠٠٠) هزار نسخه**

**چاپخانه: پیروز**

**تاریخ: ١٣٦١**

# پاشکۆ

## کۆماری ئارارات

## ١٩٣١-١٩٢٧

ن:کریس کۆچرا

و:حەمە کەریم عارف

## کۆماری ئارارات (١٩٢٧-١٩٣١)

١- دامەزراندنی خۆی بوون (( سەربەخۆیی)):

چۆنیەتی دامەزرادنی کۆمەڵەی خۆیبون بە دروستی نەزانراوە.بە گوتەی یەکێك لە دامەزرێنەرانی خۆیبوون،لە بەهاری ساڵی (١٩٢٧)دا،لە بنارەکانی ئاراراتدا بە ئامادەبونی نوێنەری چوار رێکخراوی نەتەوەیی کورد واتا:((تەعالی کوردستان))،((تەشکیلاتی کوردستان))،((میللیەتی کورد))و((کۆمیتەی سەربەخۆیی)) کۆنگرەیەك بەستراوبرپاری هەڵوەشانەوەی خۆیان دا تا لە یەك رێکخراودا واتە لە ((کۆمەڵەی خۆیبوون))دا یەك بگرن ."١"

بەلام پێدەچێت ئەم کۆبونەوەیە لە شاری بحەمدونی لوبناندا کرابێ، هەڵبەتە ئەم بۆچوونە لەم رووەوە دروست دەنوێنێ،چونکە کوردستانی تورکیا لەو دەمەدا مەیدانی کاری عەسکەرتاریەت بووە."٢"

کۆمیتەیەکی تەنفیزی، کۆمەڵەی خۆیبوون بەرێوەدەبات، کە بارەگاکەی لە حەڵەبە- تا هاوینی ساڵی ١٩٢٨کە لە لایەن دەسەلاتدارانی فەرەنسیەوە ((پەرتەوازە)) دەکرێ. گەلێك لە ناوداران و پیاوماقولانی کوردی ئاکنجی قەستەنتەنیە، بە تایبەتی ئەندامانی ماڵباتی بەدرخانیەکان،لەم کۆمیتەی تەنفیزیەدا دەبینرێن:جەلادەت بەدرخانی کوری ئەمینعالی بەدرخان سەرۆکی کۆمیتەکەیە. ئەندامەکانی تری کۆمیتە بریتی بوون لە کامەران وسورەیا بەدرخانی برای جەلادەت، مەمدوح سەلیم و شاهین بەگ .(

ڕێبەرە سەرەکییەکانی خۆیبوون بریتی بوون لە : قەدری جەمیل پاشا ،جەلادەت عالی بەدرخان ،حەسەن ئاغا حاجۆ ،ئیحسان نوری پاشا، ئەکرەم جەمیل پاشا ،مەمدوح سەلیم و عارف عەباس.)

سەرکردایەتی((خۆیبوون))سوورن کە دەرس وپەند لە شکستەکانی رابردوو وەربگرن بۆیە دەیانەوێ زۆر بە نهێنی وبە پارێزەوە کار بکەن، هەموو تیرەوتایفە کوردەکان بەلای شۆرشدا ڕابکشێن،چالاکیەکانی خۆیان هاوئاهەنگ بکەن،جەنگاوەرانی کورد بە چەك وتەقەمەنی تازەو هاوچەرخ چەکدار بکەن و بەرەبەرە فێری یاساو رێسای جەنگیان بکەن.

ئەم گروپە کە نەسلێك بەر لە تێوریسێنانی جەنگی پارتیزانی ئەمەریکای لاتینی رێسای ( بنکەی شۆرشگێری)یان داهێنا، لێدەبڕێن((لە یەکێك لە شاخەکانی کوردستانی بندەستی تورکاندا بنکەیەکی سوپایی دامەزرێنن کە لە شەرێکی یەکجارەکی وچارەنوس سازدا لە بری مەخفەر و مەڵبەندی مەشق وراهێنان وبارەگا بەکاری بێنن)) وئەم مەڵبەندە لە ژێر دەستی (سەرکردایەتی هێزی یەکگرتووی کوردا بێت)) .

ڕێبەرانی((خۆیبوون)) کە سوورن لەسەر ئەوەی تا ((وەدەرنانی دوا سەربازی ترك لە مەرزی کوردستان)) درێژە بە شەڕ بدەن، هەموو هەوڵێکی خۆیان دەخەنە کار کە دژمنایەتی وڵاتانی دراوسێ نەکەن و رایدەگەیەنن کە ((خوازیاری ئەوەن باشترین پەیوەندی دۆستانەیان دەگەڵ دەوڵەت ومیللەتی ئێرانی برادا هەبێ ))- هەرچەندە ئەمە ڕێ لە دەوڵەتی ئێران ناگرێ کە- راستە تا رادەیەك بە دەستی خۆی نابێ- لە سەرکوتکرنی راپەرینی کورددا یارمەتی ترکان بدات .

سەربارەت بە عێراق وسوریا-خۆیبوون ،دووپاتی دەکاتەوە کە (( رازی وخۆشحاڵە بەو مافانەی کە بە پێی بڕیارەکانی سایەنشینی بە کوردی ئەم دوو وڵاتە دراوە وخوازیاری مافی پتر نیە بۆیان.)) هەڵبەتە ئەم تەگبیرە سەربارەت بە بزووتنەوەکە تەگبیرێکی زیرەکانەیە وخۆ پاراستنە لە دژمنایەتی بەریتانیا وفەرەنسا.

سەرەنجام،رێبەرانی رێکخراوی تازە(خۆیبوون)((لێدەبڕێن هەرهەموو بەدحاڵی بوون وساردییەکی نێوان کورد ومیللەتی ئەرمەنی بە یەکجارەکی حەڵو فەسڵ بکەن)) ."٣"

لە راستیدا ،پەیوەندی نزیک لە نێوان خۆیبون وحیزبی ناسیونالیستی ئەرمەنیان ((داشناك))دا هەبوو،هەڵبەتە ئەم پرۆپاگەندەیە ناچیتە ئەقڵەوە کە گوایە خۆیبوون((لەسەر داوای)) ڤ. پاپازیان، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی داشناك دامەزرابوو.بە پێی راپۆری ئینگلیزان،"٤"پاپازیان بەخۆی لە کۆنگرەی خۆیبووندا بەشدار نەبووە."٥"بە هەرحاڵ ئەرمەنییەکان بەشێك لە تەقەمەنی و چەکی شۆرشگێرانی ئارارات لە رێگەی تەورێزەوە دابین دەکەن.

زانیارییەکی روونی ئەوتۆ لەمەڕ جۆری پەیوەندی کردنی کۆمەڵەی خۆیبوونی ئاکنجی حەڵەب ، بە هێزە چەکدارەکانی خۆیانەوە لە ئارارات لە دەستدا نیە،چونکە یەکێك لە جوملەی ئەرك و کارەکانی دیکەی کۆمەڵە ئەوە بوو کە لە ئەورووپادا پروپاگەندە بۆ شۆرشی کورد بکات، دەیتوانی بە ئاسانی ئەم گومانە لای خەڵکی پەیدا بکات کە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر پێشمەرگەدا، کە بەخۆی تاقە رشتەی پەیوەندی ئەوان بوو بە جیهانی دەرەوە،هەیە .

لە ساڵی ١٩٢٥بەسەرەوە شۆرش بەعەمەلی لە کوردستانی تورکیادا ،بە تایبەتی لە دەڤەری بایەزیدو ئاراراتدا کۆتایی نەهاتبوو.بەلام دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی خۆیبوون پێیان ناخۆش نیە بڵێن بزوتنەوەیەکیان چێکر کە بەر لەوان لە راستیدا وجودی هەبوو،وپاش رۆیشتنی فەرماندەی گشتی هێزەکان((ئیحسان نوری)) لە هەل ومەرجێکدا کە لە هەلاتن دەچوو،خێرا هەموو دەسەلاتێك بەسەرییەوە لە دەست دەدەن.

بەلام گومان لەوەدانییە کە کۆمەڵەی خۆیبون لە دەرێی مەیدانی شەردا زیاتر گروپە نەتەوەییە کوردەکان لە دەوری یەکدی خڕدەکاتەوە،ولق لە هەموو جیهاندا،تەنانەت لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، بەتایبەتی لە دیترۆیت دا دەکاتەوە."٦"

٢- ڕوو بە ڕوو بوونەوەکانی ساڵی ١٩٢٧:

راپۆری سیاسەتوانانی ئاکنجی ئێرانوتورکیە ئەوە دەگێرنەوە کە لە ساڵی ١٩٢٧دا سەرتاسەری کوردستانی تورکیا لە جموجۆڵ دایە:لە دەوروبەری دیاربەکر ومۆش ،خنیس وبولانیك، ترس و لە رزیان لە ناوچەکەدا بلاوکردووەتەوە.ناوچەی بەتلیس وکۆساری ئاراراتیش وەتر.

یەکێك لە هێرشە سەرەتاییەکانی تورکیا لە ئەیلولی ١٩٢٧دا لە دۆلی زیلان، دووچاری شکستێکی کارەساتئامێز دەبێت:شۆرشگێرانی کورد بە هاوکاری ئەو چەکدارە عەشایەرانەی کە لە ئێرانەوە هاتوون،ئەم پاشەکشەیە لە سوپا هەشت هەزاریەکەی تورکیا دەکەنە کارەساتومسیبەتێکی راستەقینە:چوار تۆپ و ٢٥ رەشاشیان لێدەگرن وچواردە ئەفسەر وسەدان سەربازی ترك بەدیل دەگرن."٧"

قومتـــەکانی تـــرك پـــاش ئـــەم شکـــستە خوێناوییـــە بـــۆ دیـــادین دەکشێنەوەودەوڵەتی ترك ئەم سەرکەوتنەی کورد دەداتە پاڵ هاوکاری تـیرە کوردەکانی دەڤـەری ماکۆودەوڵـەتی ئێـران ئاگـادار دەکاتـەوەوداوای لێـدەکات سـنور داخـات وئـەو کوردانـەی تورکیـا کـە پـەنا وەبـەر ئـیران دەبـەن چـەك بکات."٨"

٣- هەڵویستی سۆڤیەت:

لـەم شـەڕانەدا کـە لـە خـاکی دراوسـێی دیـوار بـە دیـواری مـەرزی باشـووری سۆڤیەتداولە ناوچەیەکی زۆر هەستیاردا لە گەڕدا بـوو هەڵوێـستی سـۆڤیەت یەکجار بە تـەمتومان‌ونادیار دەبێ. سـۆڤیەت ، لـە بـەهاری سـاڵی ١٩٢١دا دوو پەیمانی دەگـەڵ ئێـران و تورکیـادا بەسـتووە، بـە پێـی ئـەم جووتـە پەیمانـە نـاتوانێ پـشتیوانی شـۆڕش وبزاڤێکـی نەتـەوەیی کـورد بکـات کـە مەبەسـتی پارچە پارچە کردنی هەر یەکێك لەم دوو وڵاتە بێت.

سـۆڤیەتیش وەکـو فەرەنـسا،بەڵام بـە هەنجـەت‌وبیانوی جیـاواز لـە هـی فەرەنـسا،مەسەلەی سـەربەخۆیی کوردسـتانی بـە دەسیـسەوپیلانی شـومی بەریتانیا دەزانی.

کاراخان،یـاردەدەری کۆمیـسەری دەرەوەی سـۆڤیەت لـە هـەیڤی١٩٢٧/٧دا پـەیمانێکی دەگـەڵ تورکیـادا مـۆرکرد کـە دژی بزووتنـەوەی کـورد بـوو:ئـەم پەیمانە لە مۆسکۆ لەلایەن زەکـی بـەگ وبـە ئامـادەبوونی سـەفیری جـارانی سۆڤیەت لە تورکیا(ئارالۆف) ئیمزا کرا "٩".

ئەو پەیمانی یەکێتی وهاوکارییەی لە نێوان ڕێبەرانی خۆیبوون ورێبەرانی حیزبی ناسیونالیستی(داشناك)دا بەسترابووە هۆی ئەوەی سۆڤیەت زیاتر دژایەتی کورد بکات.

لە ساڵی١٩٣٠دا لەو کاتانەدا شەڕی زۆر قورس لە دەوروبەری ئارارات لە ئارادا بوو،سۆڤیەتەکان مژولی دامرکاندنەوەی شۆرشێکی دیکەی نەتەوەیی بوون کە لەلایەن ئەرمەنیەکانەوە هەلگیرسێنرابوو، وەختێ کە کوردەکانی سۆڤیەت و ئەرمەنییان یارمەتی شۆرشگێرانی ئارارات دەدەن،سۆڤیەتەکان هاوکاری ترکیان دەکرد:سوپای سۆڤیەت بوارو دەراوە سروشتیەکانی ئاراسیان کە سنوری نێوان هەر دوو وڵات پێکدەهێنێ بە تەلی دڕکاوی وسەگی پۆلیسی قایم وپاس دەکەن،لێرەولەوێ مەخفەری دیدەوانی دادەنێن ودەورێی سوارە بە بەردەوامی بە هێلە سنوریەکاندا دەگەرێن....بەلام وێرای ئەمانەش سنور هەرگیز بە تەواوەتی ناگیرێ."١٠"

لە کۆتایی مانگی٧/١٩٣٠دا بەر لەوەی لەشکری تورکیا هێرش بۆ سەر ((قوللە وقەلای)) ئارارات بەرێ، قوەتێکی سوپایی سوارەی ٥٠٠ کەسی سۆڤیەتی دەگاتە گوندی دوەلوی نزیکی ئاراس، قوەتەکە دوو رۆژ لەم گوندە دەمێنێتەوە،ئەوجا شەوێك لە پڕ قوەتی ناڤبری ((ون دەبێ))... دێهاتیانی دووەلو دڵنیان کە درەنگە شەوانێ لە ئاراس پەڕیونەتەوە تا بچنە هیمدادی هێزی ترکان و شەڕی کوردان بکەن."١١"

هەرچەندە بەشداری راستەخۆی سۆڤیەتەکان لە سەرکوتکردنی بزووتنەوی ئاراراتدا هەرگیز نایەتە سەلماندن،بەلام هەلوێستی یەکێتیی سۆڤیەتیش لە داپۆشین نایەتوخوێندنەوەی هەلوێستی سۆڤیەت زۆر زەحمەت نیە.((لە پشت ئەو شەڕانەوە کە لە ئاراراتدا روودەدەن ،دیسان دەبێ دەستی

ئیمپریالیزمی جیهانی ببینرێ کە دەیەوێ پەردەیەکی ئاسنین بە دەوری یەکێتیی سۆڤیەتدا بکێشێت))."١٢"

ترك لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٠دا بۆ جاری دووەم هێرش دەکەنە سەر خەباتکارانی ئارارات وئەم هێرشەیان لە هێرشی یەکەم سەرکەوتووتر نیە،لە شکری ترك هەر زوو ناچار دەبێ لە بایەزید بارگە بخات تا زستانەکە لە وێندەر رابوێرێ.

بۆ یەکەمجار ناوی فەرمانسدەی تازە یان((راوێژکاری سوپایی)) کوردان ئیحسان نوری دەبرێ .

هەر لەم کاتانەدا کوردی دەڤەری بەتلیس رادەپەرن و تا دەوروبەرو قەراغی شار دێنە پێشێ .

٤ - ئیحسان نوری و راپەرینی ئارارات:

ئیحسان نوری کە بەتلیسیە وسەرگوردی جارانی سوپای تورکیە ،بە گوتەی مێژوونووسانی کورد لە ساڵی١٩٢٥دا لە کۆسارەکانی بۆتاندا، لە بیت الشهاب، شۆرشێکی هەلگیرساندبوو وئەوجا دەگەڵ چەند سەد جەنگاوەرێکدا پەنای وەبەر کۆسارێن ئارارات برد بوو .

لە ساڵی١٩٢٧دا وەکو((نوێنەری شۆرشکەرێن ئاگری داخ(ئارارات) بەشداری کۆنگرەی خۆیبوون دەکات.چونکە لەلایەن کۆنگرەوە رادەسپێردرێ((مەڵبەندێکی مقاومەت))دابمەزرێنێ،هەڵبەتە ئەویش بۆ ئەم مەبەستە کۆسارێن ئارارات هەڵدەبژێرێ وساڵی١٩٢٧ بۆ((کۆکردنەوەی هەموو ئەو نیشتیمانپەروەرانە تەرخان دەکات کە لە کۆسارەکانا پەرتەوازەن))"١٣".

ئیحسان نوری لە ساڵی ١٩٢٨دا ((دەبێ بە سەرکردەی چەند هەزار جەنگاوەری سازو ئامادەو مەشق دیتوو))و دام ودەزگایەکی ئیداری بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم پاشا حەسکی،خەڵکی تیللۆ ناسراو بە حەسکی تیللو،دێتە دامەزراندنو وئالای کوردستان هەڵدەکرێ.کۆماری چکۆلەی کوردی ئارارات لە دایك دەبێ."١٤"

٥- ئا رارا ت:

لە جیهاندا کەم جێگە هەیە بە ئەندازەی ئارارات(ئاگری داغ) باش ولەبارو هەموار بێ بۆ وەی بکرێ بە((بنکە))ی شەڕی پارتیزانی.

ئارارات،بە هەردوو لوتکەکەیەوە،واتا ئاراراتی بچووك وگەورە،وبە خەرەند وزەندۆڵەکانیەوە قەلایەکی سروشتی بە پانتایی ٩٦٠ کیلۆ مەتری چوار گۆشە پێکدەهێنێ! ئەم دوو لوتکەیەی ئارارات کە بە ڕاستە هێل ١٢ کلیۆمەتر لێك دوورن یە کەمیان ٣٣٩٦ مەتر ودووەمیان ٥١٥٧ مەتر لە ئاستی دەریاوە بەرزن وهەردووکیان لە ملەی سەرداربولاکدا کە ٢٤٤٥ مەتر بەرزە، یەکانگیردەبن

لەم رۆژگارەدا سنووری تورکیا وئێران بە کێوی ئاراراتدا رەت دەبوو، لوتکە وداوێن وبناری رۆژهەلاتی ئاراراتی بچووك بە شێك بوو لە خاکی ئێران، وئەمە خۆی لە خۆیدا کۆسپێك بوو لە رێگەی ترکەکان ودەرفەتی نەدەدان کە ئابلۆقە وگەمارۆی شۆرشگێرەکان بدەن.

ئارارات گرکانێکی خامۆش ونشێوێکی٤٥نمرەییەولە ملەی سەرداربولاك دایەو،جێیەکی یەکجار نافۆلاوناهەموارە.

ئـاراراتی گـەورەش ناهــەمووارو پڕخەرەندوزەنــدۆڵی گرکـانیوپڕ پــێچ وپەناوئەشکەفتانە،کە گەورەترین ئەشکەوتی دەکەوێتـە بنـاری رۆژهـەڵاتی چیاکەودەڕوانێتە روسیا وسێ هـەزار کـەس بـە خاوخێزانومەڕوماڵاتیانـەوە دەگرێ."١٥"

پێـشتر،یانی لـە یەکـەم جـەنگی جیهانیـدا کـوردێن جـەلالی پـەنایان وەبـەر ئاراراتی گەورە بردبووتوانی بویان لـە هەنبـەر هـەموو هەوڵوکۆشـشەکانی رووس وئەرمەن بۆ وەدەرنانیان لەو ناوچەیە مقاوەمەت بکەن: ئـەم خەڵکـە کـە بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵان لـە ١٥٠ کیلۆمـەتری پـشت شـەڕگەوە بـە تـەنێ مابوونەوە توانیان تـا پێـشرەوی لەشکری عوسمانیـان لـە سـاڵی ١٩١٨ لـە نێـو خاکی داگیرکراوی روسیادا، بەرگری بکەن."١٦"

٦- دان و ستاند نێن ساڵی ١٩٢٨:

دەوڵەتی تورکیا لەساڵی ١٩٢٨ لێدەبڕێت لە گەڵ شۆرشڤانێن کوردا بکەوێتـە گفتوگۆ، جا بەم مەبەستەو بۆ وەی کەشوهەوایەکی لەبار بـۆ((لێکـدی حـاڵی بـوون))بخوڵقێنێ،چـەند هـەنگاوێکی عەمـەلی دەنـێ:نـەفی کـردن رادەگـرێ ، قانوونی((راگرتنی سزای ئیحدام)) بەپەسەندکردن دەگەیەنێ و(عـەفوات بـۆ ئەو کوردانە دەردەکات کە لـە زەرفـی سـێ هەیڤانـدا بگەرێنـەوە نێـو مـاڵ و منـداڵی خـۆ) مۆڵـەتی گەرانـەوە بـە نـەفی کـراوان دەدات وزنـدانییان ئـازاد دەکات ...لێ زمانی کوردی هێشتا هەر یاساغە

دەوڵەتی تورکیاسـورەیا بـەگی والی بایەزیـد رادەسـپێرێ کـە گفتوگۆ دەگـەڵ شۆرشڤانان بکات.والی بایەزید بە نامەیەکی دوورودرێـژ حەسـکی تیللـۆ ئاغـا ئاگادار دەکاتەوە کە واز لە شۆرش ودژایەتی دەوڵـەتی تورکیـا بێنـێ و ئەمـە بـە کـارێکی((ناماقول وگەوجانـە دەزانێـت))،((دەوڵـەتی تورکیـا، دەوڵـەتێکی

شەش سەت ساڵەیەو خوێنەوارانی ناو ئێوە ئەمە دەزانن.لە ماوەی ئەم شەش سەت ساڵەدا هەزاران کەس دژی دەوڵەت هەستاون...چیان بە چی کردووە ؟- هیچ،دەوڵەت وەکو سەروەر وگەورەی مەملەکەت بە دەقی خۆیەوە ماوەتەوە)) و داوا لە حەسکی تیللۆ ئاغا دەکات کە سوود لەم فەرمانی عەفواتە وەربگرێ.

والی بایەزید چەند وشەیەکیش لەمەڕ ئیحسان نوری دەخاتە ئەم نامەیەوە:((بیستوومە کە ئەفسەرێکتانیش لەگەڵدایە.من وەکو هاوپیشەیەك داخ بۆ حاڵی ئەم ئەفسەرە دەخۆم.من نازانم کە ئەو چ تاوان وخەتایەکی کردووە)) .

بەلاّم ئەم پەنابردنە بەر هەستوسۆزی هاوبەستەگییە دەگەڵ پیاوێکدا کە هاوفەرهەنگ یاهاوچینی ئەوە بێ ناکاموبێ ئەنجام دەبێ، وبەرسفی حەسکی تیللۆ توند وغرورئامێزە:(( ئەگەر راستەوعەفوات  لە گۆرێدایە ،دەبێ ئەم عافواتە بۆ هەمووان بێ ودەگەڵ یاساکانی چەرخی شارستانیەتدا بگونجێت. ئەگەر دەیانەوێ بەم عەفواتە خەڵکانی کێوی فریوبدەن، ئەمەیان باسێکی دییە.ئێوە نابێ بەم جۆرە دەگەڵ خەڵکانی وەکو ئێمەدا قسەبکەن،چونکە ئێمە بەشی خۆمان ئەزموونمان هەن و دنیامان دیتوە.مرۆڤی هۆڤی لە هیچ شوێنێك نەماون.سەرانی گەورەی دەوڵەتی تورکیا دەبێ دان بەم حەقیقیە تەدا بنەن)) و لە سەری دەروات:(( ئەگەر بەراستی عەفواتێك لە گۆرێیە ئەدی بۆ میر وبەگ و ژن ومندالأنمان، کە هیچ گوناهێکیان نەکردووەو دوو ساڵە لە تاراوگەن ودژوارترین ژیانیان گوزەراندووە،بۆ سەر ماڵ وحاڵی خۆ نەگە راونەتەوە؟ تا دوورخراوەکان نەگەرێنەوە سەر ماڵ وحاڵی خۆ،ناکرێ چ باسێك لەگەرانەوەی ئێمە بکرێت))"١٧". هەر لەو رۆژانەدا یەکێك لە

پیاوماقولانی بایەزید نامەیەك بۆ یەكێكی دی لە شۆرشڤانانی ئارارات بە نێوی نەعمان ئەفەندی دەنووسێت:نعمانە فەندی كۆنە كارمەندی دامودەزگای دەوڵت بووە، پاشان نەفی كراوە، لە تاراوگە هەڵاتووە ودوای ٤٧ رۆژە رێ توانیویەتی خۆی بگەیەنێتە ئارارات.نامە نووسی نافبری لە نامەكەیدا دەنووسێت كە هەمیشە لە خۆی دەپرسێت چون نەعمانە فەندی دەتوانێت لە نێو ((كۆمەڵە خەڵكێكی جاهیل ونەزان)) بژی،و پێشنیازی بۆدەكات كەڵك لەم دەرفەتی عەفواتە وەربگرێ،ودەڵێ كارێكی هاوتای كاری پێشووی،لە هەر شوێنێكی وڵاتدا خۆی بیەوێ،دەدەنێ.

بەرسڤی نەعمانیش توندە:((پاش ئەوەی كەدیتم و پاش ئەوەی كە بەسەرم هات وهەموو ئەم شتانەش بێ ئەوەی خەتایەك یان گوناهێكم كردبێ بێ دادگایی، وهەر بە هەوەسی دەوڵەت .... بەڵێ پاش ئەم هەمووە، هاتنەوەوقەبولكردنی((عەفوو))دەكاتە كارێكی گەوجانە.منێك كە وڵاتم وبران بووەو بەراست وبەچەپدا تاڵان دەكرێ كە مەسەلە بێتە سەر ژیان لە هەر شوێنێ بژیم وەكو یەكە))"١٨".

دەوڵەتی توركیا دوای ئەوەی هەوڵێكی بێهودەی زۆری دا كە لە رێگەی عەفواتەكەیەوە شۆرشڤانانی ئارارات بێنێتە رەدا،لە مانگی ئەیلوولی ١٩٢٨دا شاندێكی گرنگی بۆ بایەزید نارد تا راستەخۆ دان وستاندن دەگەڵ ئیحسان نوری دا بكەن. شاندەكە بریتی بوو لە دووكەس لە نوێنەرانی ئەنكەرە،والی قەرەكلیساوفەرماندەی لیوای ٢٩ وقایمقامی دیادین وبایەزید.ئەم دیدارە لە ١٩٢٨/٩/١٥دا لە شیخلی كوپرو،لە سێ كیلۆمەتری بایەزید،لە بناری رۆژهەڵاتی ئارارات ئەنجام درا .

شاندی نوێنەرانی ترك پێشنیازی ئەوە بۆ ئیحسان نوری،کە بەشەست سوارەوە هاتووەتە دیدارگاکە دەکەن کە خۆی و هەر هەموو هاورێکانی عەفوو دەکرێن ئەگەر بەڵێنی گوێرایەڵی بدەن و چەکەکانیان تەسلیم بکەن.هەروەها ترکەکان بەڵێن بە فەرماندەی سوپایی(کۆماری کوردی) ئارارات دەدەن کە پلەی جەنەراڵی دەدەنێ و موچەیەکی زۆری بۆ دەبڕنەوە ودەیکەن بە مولحەقی عەسکەری لە هەر وڵاتێکی ئەورووپاییدا کە ئەو بیەوێ.دیارە چ باسێکی داواو مافەکانی گەلی کورد نەهێنرایە گۆرێ وئیحسان نوریش پێشنیازەکانی دەوڵەت رەفز دەکات.ئەمە بە مانای پچڕانی پەیوەندییەکانە.

٧- سەرەتای شەڕەکان :

لە گەڵ سەرەتای توانەوەی بەفرا،واتە لە ناوەراستی ئازاری ١٩٢٩وە، ترکان دەکەونە خڕ کردنەوەی دوو سوپای( ١٢-١٥) هەزار کەسی لەئیگدرولە بایەزید،لەگەڵ نزیکەی سی فڕۆکەدا.

ساڵح پاشا سەرکردایەتی ئەم هێزانە دەکات. هاوزەمان دەگەڵ ئەم خۆ ئامادەسازیەدا دەسەڵاتدارانی ترك، بە تایبەتی لە ئەرزرۆمدا دەکەونە خەڵك گرتنێکی زۆر. لە ئەرزرۆم دا نەوەت کەس دەگرن. کە یەکێکیان سەلاحەدینی کوری شێخ سەعیدی پیرانە.(کە ئەو کاتە تەمەنی ٢١ ساڵ نابێت) و بە ١٥ ساڵ زیندانی لەگەڵ کاری قورسدا حوکم دەدەرێ، بەڵام ((عەفو)) دەیگرێتەوەوماوەی زیندانیەکەی بۆ دەکەن بە دووازدە ساڵ و نیو!

ئۆپەراسیونی ئەسڵی لە ١٩٣٠/٦/١١دا بە هێرش بۆ سەر (بنکە سنووریەکانی)؛ کۆماری کوردی ئارارات دەست پێدەکات...لە نیوەی دووەمی حوزەیراندا ترکەکان روو بە رووی هێزی کورد لە ئارارات دەبنەوە.

٨- دژە هیرشی کوردان(نیوەی یەکەمی ١٩٣٠/٧):

بەڵام کوردەکان زۆر زوو دەست بە عەمەلیاتێکی زۆر بەربڵاودەکەن. ئیحسان نوری وئیبراهیم بەگی سەرۆکی کوردێن جەلالی ومەحموبەگ کە سەرگوردی جارانی لەشکری عوسمانیە، بەیارمەتی وهاوکاری عەشایری کوردی هەردوو دیوی سنوری ئێران وتورکیا، دەکەونە پەلامار دانی پاشهێزەکانی تورکیا وهەوڵدەدەن لێکدییان دابڕن وبە یارمەتی خەڵکی ناوچەکە بە باشور و باکوری دەریاچەی واندا رەت ببن وپەلاماری دیاربەکر بدەن.بەم جۆرە زۆری پێناچێت کە شەڕگەیەکی ١٥٠ کلیۆمەتری لە باکوری ئاراراتەوە تا خۆشابی رۆژهەلاتی وان دروست دەبێت.

لە ٥-١٩٣٠/٦/٩ هێزی ترك وکورد لە دەشتی زیلانی باکوری ئەرجیسدا دەکەونە شەڕێکی قورسەوە.کوردەکان رووبە رووی مقاوەمەتێکی توند دەبنەوە،سەرەنجام لە بەردەم ترکاندا کە لە رووی ژمارەوە سێ ئەوەندەی کوردن و لە رووی چەك وتەقەمەنی وتفاقی شەرەوەش لە رادەبەدەر باڵا دەستترن دەشکێن."١٩"

هەندێ لە قووەتەکانی کورد لە باکوری واندا لە هێزەکانی دی دادەبڕێن و ئەوانی دی روو دەکەنە ئێران وئارارات.زیانی کوردەکان: ٩٠٠ کوژراو ٢٤٠٠ بریندار و ٣٦٠ بێ سەروشوێە، زیانی ترکەکان زۆر لەوەش قورسترە: ٢٨٠٠ کوژراو ٤٠٠ بریندارو ١٧٠٠دیل."٢٠"

کوردەکان دەڵێن کە گوایە ٢٤تۆپو ٦٠ رەشاش و شەست هەزار فیشەکیان گرتووە ودوانزە فڕۆکەیان خستووەتە خوارەوە! هەڵبەتە ئەم ژمارانە زیادیان پێوە نراوە، بەلاّم بە پێچەوانەی پرۆپاگەندەی چاپەمەنیە تركییەكان، شۆرشی كوردان هێشتا زۆر لە شكستەوە دوور بوو.

لەم سەروبەندەدا ژنێکی ئینگلیز بە نێوی رۆزیتا فۆربز راپۆرتێکی تاقانە لەمەڕ شۆرشی ئارارات دەخاتە بەردەست:ئەم ژنە پاش ئەوەی بە بێهودە هەوڵیدا بۆ ئەرمەنستانی سۆڤیەت بروات، سەرەنجام بۆ کوردستان چوو ویازدە رۆژان لەگەڵ شۆرشڤانانی کوردا مایەوە،لەم ماوەیەدا وێنەی یەکێك لەو فرۆکانەی گرت کە کوردەکان خستبوویانە خوارەوەو یەکێك لەو دوو تۆپەشی بە چاوی خۆی بینی کە کوردەکان گرتبویان.

((رۆزیتا فۆربز))ش هەندێك کۆمەکی ئێران بۆ شۆرشی کورد دەسەلمێنیّو ئەوە دەگێرێتەوە کە چۆن((کوردەکان کە نەیاندەزانی ئەو تۆپانە بەکاربێنن کە گرتبوویانن وداوایان لە زەفەرالدەولە، فەرماندەی هێزەکانی ئێران لە ئازربایجان(دژمنی دێرینەی سمکۆ)کرد کە تۆپچیان بۆ بنێریّ ))

((هەڵبەتە خویا نیە ئایا زەفرالدەولە نەیوست ئەم کارە بکات یان ئێرانیەکان ترسان.....بەلاّم سەرەنجام زەفرالدەولە بۆ ئەم مەبەستە چەند ئەرمەنییەکی نارد، کە زۆر ترسابوون ودەترسان ئەگەر تیرەندازی بکەن ترکەکان بیانکوژنوئەگەر تیرەندازی نەکەن کوردەکان بیانکوژن ولەو دەپارانەوە کە لەگەڵ خۆیدا بۆ ئێرانیان بەرێتەوە."٢١"

هەر(رۆزیتا فۆربز) لەسەری دەروات:((وا دیاربوو کوردەکان شەڕیان بە جۆرە سەرگەرمییەك دەزانی وهەر ژنێکت دەبینی منداڵێکی لەکۆڵ و تفەنگێکی بە دەستەوە بوو.))"٢٢"

٩- کێشمانەکێشی تورکیاو ئێران:

ترکەکان کە لێبڕاون کاری کورد یەك لایی بکەنەوە، کۆسپێکی گەورەیان دێتە ڕێ:سنوری نێوان ئێران وتورکیا بە پێی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی ١٩٢٤دا بە ئاراراتی بچووکدا دەڕۆیی.بۆیە لەشکری ترك نەیدەتوانی بچێتە خاکی ئێرانەوەوگەمارۆی ئەو کوردانە بدات کە خۆیان لە ئاراراتدا قایم کردبوو وشۆرشڤانان هەموو کاتێك دەیانتوانی خۆیان بە ئێراندا بکەن و یارمەتی و کۆمەك لە ئێران وەربگرن..جا لەبەر ئەمە سەرکەوتنی یەکجارەکی ترك وەستابووە سەر ئێرانیەکان کە بە هەشت سەد سەربازەوە چاودێری وپاسەوانی سنوریان دەکردو ئەم ژمارەیە بە هیچ جۆرێ بەشی ئەم مەبەستەی نەدەکرد.لەلایەکی دییەوە،دەوڵەتی ئێران کە توانی بووی لە شکستی سمکۆ بەملاوە ئاسایش لە کوردستانی ئێراندا بەرپا بکات، نەیدەویست دەسکەوتو ئەنجامەکانی ئەم سیاسەتە بەهۆی بەکارهێنانی قوەتی سوپایی دژی شۆرشڤانانی ئارارارت کە زۆریان سەربە تیرە وتایفەکانی ئاکنجی ئێران بوون، بخاتە خەتەرومەترسییەوە.

سەرەنجام ئێرانیەکان وێرای ئەو پەیمانانەی کە دەگەڵ تورکیادا هەیان بوو، چ دژایەتییەك لەمەڕ سەربەخۆیی کوردانی عوسمانی دەرنابڕن...تاقە مەرجیان ئەمەیە کە ئەرمەنیانی پێناوی نێوان ڕێکخراوە ئەرمەنییەکان‌وشۆرشی کورد لە ئەرمەنیانی هاوولاتی ئێران نەبن‌ونایەڵن کە ناسیۆنالیستانی ئەرمەنی تەورێز زۆر لە سنوور نزیك ببنەوە ،یان لە ماکۆ جێگیر ببن"٢٣"و بە درێژای ئەو ماوەیەی کە شۆرش بەردەوام بوو،

دەوڵەتی ئێران پەیوەندی خۆی لەگەڵ نابڕێ و لە ساڵی ١٩٣٠دا چەندین نێردەی خۆی بۆ ئارارات دەنێرێ."٢٤"

هەردوو دەوڵەتی تورکیا و ئێران زنجیرە یاداشتێکی توندوتیژ بەیەکدی دەدەن، لەمانگی ئابی ١٩٣٠دا لەتاراندا بەنیگەرانیەوە باسی ئەگەری شەڕ دەگەڵ تورکیادا دەکرێ، نیگەرانی لەو رووەوە کە ئێران لەحاڵی حازردا ئامادەیی شەڕێکی وای نییە."٢٥"

ترکەکان بەپەلەن وحەزدەکەن رۆژێ زووتر ئەم گیروگرفتە یەکلابکەنەوەوله کۆتایی تەموزو سەرەتای ئابدا ترسی ئەوەیان لێدەنیشێت کە شۆرش بەشێوەیەکی ترسناکتر زیاتر پەرەبسەنێ.

١٠- موداخەلەی شێخ ئەحمەدی بارزان:

له عێراقدا شێخ ئەحمەدی بارزان لەدەوروبەری ١٩٣٠/٧/٢١دا ١٠٠یان ٢٠٠ جەنگاوەر بۆ یارمەتیدانی کوردەکانی دەڤەری دراوسێی خۆی(ئورامار)لە قەڵەمڕەوی تورکیادا دەنێرێ.

له ١٩٣٠/٧/٢٦دا دەوڵەتی تورکیا بەرەسمی لەلای سەفیری بەریتانیا گلەیی لەم کارەی شێخ ئەحمەد دەکات.دوای چەند رۆژێکی دی،واتە لەدەوروبەری هەیڤی ئابدا،شێخ ئەحمەد دووەم گروپ لە جەنگاوەرانی خۆی بۆ کوردستانی تورکیا دەنێرێ،ئەم گروپە دەم ودەست دەگەڵ هێزەکانی تورکیادا بەشەڕدێن...بەلاّم ناردنی هێزی هیمدادی ترک بۆ باشور،دەکاتە کارێك کە شەرەکە تەشەنە نەکات...لێ بەشداری شێخ ئەحمەد لە شۆرشی کوردی تورکیادا،لێرەدا تەواو نابێت:پاش شکستی شۆرش لە ١٩٣٠دا ،ژمارەیەك لەو کوردانەی تورکیا کە لەتاو سەرکوتکاری ترك هەلاّتوون.لە

ناوچەکەی خۆیدا پەنا دەدات، وئەم ژمارەیە لەم ((پەناگەیەوە)) درێژە بەچالاکی عەسکەری دژی هێزەکانی ترك دەدەن.

لە کۆتایی ئەیلولی ۱۹۳۰دا تورکیا داوا لەنوری پاشا((نوری سەعید پاشاسەرۆك وەزیری وەختی عێراق بوو))دەکات کە ڕێی هێزەکانی تورکیا بدات بێنە خاکی عێراقەوە تاکاری ئەو کوردانە یەکلایی بکاتەوە کە پەنایان وەبەر شێخ ئەحمەدبردووە.دەوڵەتی عێراقی ئەم(مافی تاقیبکردنە) قبوڵناکات،بەلأم یارمەتیدانی کوردانی تورکیا لە لایەن شێخ ئەحمەدی بارزانەوە ،دوای ماوەیەکی کەم،واتە لەئەیلولی ۱۹۳۱دا ،دەبێتە هۆی راستەوخۆی ئەو شەرانەی دژی ئەودەست پێدەکەن.

۱۱- شۆرشی حاجۆ:

لە سوریادا یەکێك لە سەرانی ناوچەیی کورد بەناوی حاجۆ بە یارمەتی کۆمەڵەی خۆیبوون بە چەند گروپێکی دەنەفەرییەوە لە سنوور ئاودیو دەبێ و لە۱۹۳۰/۸/۵دا گوندێکی چکۆڵە لە دەڤەری نەسیبین دەگرێ و لەوێندەرەوە بەیاننامەیەکی پشتیوانی کردن لە سەربەخۆیی کورد بلأو دەکاتەوەو هەموو کورد هاندەدات کە لە پێناوی کۆمەك بە هاوولأتیەکانی خۆدا کە لە ئارارات دەجەنگن رابپەرن .

هەر لەم سەروبەندەدا چەند شۆرشێکی ناوچەیی لە جۆلە مێرگ (۸/۷) و نزیکی سیرت (۸/٦)و لە لیسە (کۆتایی ئاب) ولەوانەش گرینگتر لە دیاربەکر روو دەدەن.

١٢- روخانی کۆماری ئارارات (ئەیلولی ١٩٣٠):

دەوڵەتی تورکیا لە نیوەی ئابەوە لێبڕابوو کە چیتر گوێ بە ویست ومەیلی ئێران نەدات وفەرمانی بە جەنەراڵ ساڵح پاشا دا کە پەلاماری ئەو کوردانە بدات کە لە ئاراراتدا سەنگەریان گرتبوو.

قوەتەکانی سوپای تورکیا بۆ گرتنی شوێنە گرنگەکانی رۆژ هەڵاتی ئارارات وبڕینی رێگەی پاشە کشە لە شۆرشڤانان ،لە سنوور دەپەڕنەوە."٢٦"..ساڵح پاشا رۆژی ٧/ئەیلول/١٩٣٠لە باکوری ئاراراتەوە فەرمانی هێرشی یەکجارەکی دەردەکات. ساڵح پاشا رۆژی ٩/١٠ خەتی نێوان هەردوو ئارارات( واتە ملەی سەردار بولاك) دەگرێ.دیارە ئەمە لە باری سوپاییەوە بە کۆتایی مەسەلەکە دادەنرێ....کوردەکان کە لە لایەن ترکەکانەوە تاقیب دەکرێن بەرەو باشورهەڵدێن.ئیحسان نوری، فەرماندەی گشتی هێزەکان پەنا دەباتە بەر ئێران، تا کاتی مردنی لە نیوەی مانگی چواری ١٩٧٦ لە تاران ژیا.

بەلام لە راستیدا هیچ شتێك کۆتایی نەهاتووە.

ترکەکان،درۆیەکی زۆر بە گێرانەوەی رووداوەکانەوە دەنێن و مێژوونووسانی کوردیش ئامادە نین پاژێك لە رووداوە ناخۆشەکانی ئەم قۆناغە روون بکەنەوە:کوردەکان بە تایبەتی خۆیان لەم باسە دەبوێرن کە ئیحسان نوری لە چ رۆژومانگێکدا بڕیاری بەجێهێشتنی بارەگای فەرماندەیی خۆی دا، لە کاتێکدا رۆیشتنەکەی بۆ ئێران وەکو هەلاتن وایە.

شەڕ بەدرێژایی ساڵی١٩٣١ لە ناوچەکانی سنوری ئێران وئارارات هەر دەمێنێ ،بە پێی هەندێك زانیاریان وادیارە کە ئیحسان نوری((لە کاتێکی زۆر هەستیار))دا،لە پایزی ساڵی ١٩٣٠دا لە شەڕ هەلاتووە.

کۆمەڵەی خۆیبون ئیحسان نوری بە فەرماندەی گشتی شۆرش دانابوو، کە ئەم کارەی وی بووە مایەی شەرمەزاری ئیدی رێ بە خۆ نادا کەسێکی دی وەکو فەرماندە بەسەر ئەو شۆرشانانەدا بسەپێنێ کە هێشتا لە ناوچەکەدا دەخەبتن،و هەر ئەوانە پەسند دەکات کە هەڵبژێردراوون."٢٧"

تەرازنامەی کۆماری کوردی ئارارات یەکجار خەمناکە:کوردەکان دوو شکستی گەورەیان بەسەرداهاتووە((زیلان و ئارارات))، زۆربەی کادرەکان وقەلاًی ئاراراتیان لە دەست داوە،وئەو چەك وتەقەمەنی وتفاقانەی کە بەدرێژایی چەندین ساڵ پێکەوەیان ناوە،زۆر زەرەریان هێناوە یان بە تەواوەتی لە ناوچوون.

وێرای نەبوونی زانیاری تەواو لە مەرچۆنیەتی شەرەکان،دەشێت بگوترێ کە کوردەکان بە کردنی شەڕی سوپایی‌و بەرەیی لە جیاتی شەڕی پاتیزانی لە هەموو کوردستاندا هەڵەیەکی گەورەیان کرد.

مێژوو دووبارە نابێتەوە،بەلاًم پیاو بە دەستی خۆی نییە هەندێ بویەری هاوشێوەی ئەو بویەرانەی ئاراراتی بیر دەکەوێتەوە کە نزیکەی نیو سەدەیەك پاشتر لە عێراقدا روودەدات.

١٣- تەشەنەکردنی شەڕ بۆ نا و ئێران ((بەهاری ١٩٣١)) :

دەوڵەتی ئێران،سانسۆرێکی یەکجار توندی خستە سەر ئەو بویەرانەی کە لە ناوچە سنووریەکاندا روویان دەدا،بەلاًم هەر زوو دەرکەوت کە وەزع باش نیە.

لە نیوەی مانگی ١٩٣١/٣دا ،پاش هێرشی کوردەکان بۆ سەر ناوچەی ماکو ، فەرماندەی عەسکەری تەورێز ،قوەتێکی هیمدادی گەورە بە فەرماندەیی

جەنــەراڵێك بــۆ ناوچــەکە دەنێــرێ، وسیاســەتوانانی دانیــشتووی تــاران چاودنۆری توانەوەی بەفرن تا شەڕو عەمەلیاتەکان دەست پێبکاتەوە.

دەوڵەتی ئێران بیەوێ و نەیەوێ هەمان سیاسەتی تورکیا پەیرەو دەکات و دەکەوێتە کۆچاندنی بە کۆمەڵی کوردە جەلالیەکانی ئاکنجی ناوچەی نێوان ئارارات وسنووری سۆڤیەت.لە سەرەتای نیسانی ١٩٣١دا ڕێبوارێك تووشی ((تابورێکی دریژی دە کلیۆمەتری لە کوردە دەرکراوەکانی باکور دەبێ... هەموویان ژن و منداڵ دەبن و مەگەر بە دەگمەن دەنا تاقە پیاوێکیان تێدا نیە.لە بەر زۆری عەرەبانە وحەیواناتەکانیان،خەملاندنی ژمارەی دروستی دەرکراوەکان ئەستەمە، بەڵام هەر نەبێ پێنج هەزار کەسێك دەبن.))"٢٨"

خالید ئاغا کە یەکێك دەبێ لەسەرانی تیرەی جەلالی سەر پێچی دەکات وگوندەکەی چۆل ناکات، بە پیاوەکانی خۆیەوە پەنا وەبەر تورکیا دەبات.هەر لەم سەروبەندەدا ڕێبوارێکی دی کە بەناوچەی بایەزیدو ئیگدەردا رەت دەبێت دەبینێ((هەموو ناوچەکە پڕە لە سەربازی ترك))ولە قوڵی ئاراراتەوە دەنگی هەراوهەنگامەی شەڕ دەژنەوێ:دەنگی دەستڕێژی رەشاش وگوللە تۆپ.

لەلایەکی دیەوە پاشان دەردەکەوێ کە ترکەکان بە قوڵی پتر لە دە کیلۆمەتر هاتوونەتە نێو خاکی ئێرانەوەودەربارەی گۆرینەوەی ئاراراتی بچوك بە هەندێ ناوچەی قوتور مزولی دانوستانن دەگەڵ کاربەدەستانی ئێراندا.

**١٤-هێزەکانی ئەم ناوچەیە:**

ژمارەی هێزین دەوڵەتی ئێران لەناوچەکەدا لە ساڵی ١٩٣١دا نزیکەی ٢٨٠٠ سەربازو٢٠٠٠ سەربازی ئیحتیات و١٢٠٠ کوردی((سەربە دەوڵەت))دەبن.هێزی هەوایی ئێران سێ فرۆکەیە کە بۆ کاری شناسایی بەکاردەهێنرێن .

هێزین کورد،نزیکەی٦-٧سەد کەسی سەر بە هۆزی جەلالی وحەیدەرانلون،٣٠٠ کوردی ناوچەی ئاراراتیش هاتونەتە ناو ئەم ژمارەیەوە،ئەم ٣٠٠ کوردە تفەنگی تازەوئۆتۆماتیکیان پێ بووشاجوریان لەسەربوو،هەرشاجورەی٢٥ فیشەکی دەگرت.فەرماندەکەیان فەرزەندە farzande ناوێکە کە کۆمەڵەی خۆیبوون پەسەندی دەکات،وسەرۆکی سەرکردایەتیان((برۆ))ی کوڕی ئیبراهیم ئاغای جەلالیە."٢٩"

ئەرمەنیانی داشناك وەکو ساڵی ١٩٣٠ یارمەتی وپەیوەندییەکانیان بۆ دابین دەکەن .

**١٥- یەکەمین قۆناغی شە ڕێن ئێرانیەکان(ئایار-حوزەیرانی ١٩٣١):**

هێزەکانی ئێران لە نیوەی مانگی ئایاری ١٩٣١دا بەو مەبەستەی ڕێگە لە ئیسماعیل ئاغای جەلالی بگرن ونەیەڵن شۆرشڤانانی ئارارات کۆبکاتەوە، دەست دەکەن بە هێرش بۆسەر قەرە عەینی:ئیسماعیل ئاغا کە بە پێشرەوی ئێرانیان دەزانێ،بە خۆوجەماعەتەکەیەوە پەنا وەبەر تورکیا دەبات،و ئێرانیەکان ناوچە چۆڵ کراوەکە دەگرن..لەدەور وبەری ١٩٣١/٥/١٩دا کوردە جەلالیەکان بەهاوکاری ئەو جەنگاوەرە کوردانەی کە لە تورکیاوە هاتوونە شەبەیخون دەکەنە سەر ئۆردوگای ئێرانیەکان..بەپێی ئیعترافی کەرەم خانی سەیاح،سەرۆکی کۆمیتەی پاراستنی سنوور(سنوری ئێران و

تورکیا) ئەم شەبەیخۆنە بۆسوپای ئێران(مسیبەتێك) بوو لەو گۆڕە:لەم شەبەیخۆنەدا ١٢٤ سەربازی ئێرانی کوژران و ٢٠٠-٣٠٠ سەربازیش زامداربوون.لێ بە گوتەی ژێدەرێن دیبلۆماسی بەریتانیا ژمارەی زەرەر وزیان سێ هەندەی ئەم ژمارەیە..زیانی کورد کەمە: تەنێ حەوت کوژراویان لە شەڕگەکەدا بە جێماوە (کورد هەمیشە جەنازەی کوژراوەکانیان دەگەڵ خۆدا دەبردنەوە.)

دوای ئەمە سانسۆرێکی توند دەخرێتە سەر هەواڵ ونوچەێن ئەم شەڕە:هەر سەربازێك هەواڵی شەڕ بلاوبکاتەوە دەدرێ بە دادگای جەنگی.

سەیر ئەوەیە ئێرانیەکان کە لە ئەنجامدا ئەو سیاسەتە توندەیان لەمەڕ کوردان گرتە بەرئەوانیش بەش بەحاڵی خۆیان لە رووی(نەبوونی هاوکاریەوە)لە لایەن ترکانەوە بە گلەیین!بە تایبەتی عەقید کەرەم خانی سەیاح، ترکەکان بەوە تاوانبار دەکات کە((سیاسەتی ئاشتی خوازانە))یان لەمەڕ کوردان گرتووەتە بەر،وەهەر ئەم کەسە لە شەڕی سوپای ئێراندا لە ٦/٩-/٣/١٩ گلەیی لە هەڵس وکەوتو رەفتاری ترکان دەکات."٣٠"

١٦- قۆناغی دووەمی شەڕی (تەمووزی ١٩٣١):

وێرای ئەم قسە توندوناخۆشانەش، هاوکاری نێوان هەردوو سوپای ترك وئێران پەرە دەسێنێ: لەو کاتانەدا کە سوپای تورکیا مژولی درێژەدانی شەڕوتاقیبی خۆیەتی، بە پێی گوتەی سەرۆکی کۆمیتەی ئاسایشی سنوورسوپای ئێران سێ ئەرکی لەسەرە:

- داخستنی سنووری ئێران، بۆئەوەی بە هەموو شێوەیەك رێگە لە دزەکردنی کوردان بگیرێ.

- راگوێزانی کوردی ناوچەی سنووری ئێران.هاتنی دەوارنشینان بۆ ناوچەی ئارارات قەدەغە دەکرێ و ئارارات دەبێ بە ناوچەیەکی چۆڵ.

- شەڕکردن دەگەڵ ئەو کوردانەدا کە لە ناوچەکەدا دەست بە ((تالان وراوڕووت)) دەکەن .

لە سەرەتای تەمووزی١٩٣١دا هێزێن ئێران جارێکی دی قەرەعەینی دەگرنەوە. ئەم هێزانە لە ٤ی تەموزا دەکەونە بەر هێرشی کوردانی ئێران وتورکیا وزیانێکی تا رادەیەك فورسیان لێدەکەوێ.بۆ سبەینێی هەمان رۆژ کوردەکان خەڵکی گوندێکی ئێرانی قەتڵ وعام دەکەن- ٥٠ کەس لە خەڵکی ئەم گوندە دەکوژن-وچەندین گوندی دیکەش تالان دەکەن.ئێرانیەکان سەربازانی ترك بەوە تۆمەتباردەکەن کە((جلی کوردییان لەبەر کردووە))وهاتونەتە یارمەتی کوردان،لەم لاشەوە ترکان، رووسەکان تاوانبار دەکەن کە چەکیان بە کوردان داوە!"٣١"

١٧- هاوکاری ئێران و تورکیا دژی کوردان:

وێرای گلەیی دولایانە،تاران وئەنقەرە پتر لێك نزیك دەبنەوە. ئێرانیەکان بەو کارەی ترك قایل نین کە((تا لە تواناداببێت ژمارەیەکی زۆرتری کوردان ئاودیوی خاکی ئێران بکەن،بەو بیانووەی کە ناوچەیەکی زۆر کوێستانی نییەو بەرهەق کردنیان گەلەك ئاسانترە))!"٣٢"

بەلاّم لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٢دا دوو شاندی ترك بەرەسمی سەردانی ئێران دەکەن.یەکێك لەشاندەکان بەسەرۆکایەتی جەلال بایاری سەرکۆماری ئایندەی تورکیایەوچەند ڕێکەوتننامەی ئابوری ودارایی دەگەڵ ئێراندا ئیمزا دەکات.شاندی دووەم بەسەرۆکایەتی تۆفیق روشدی وەزیری کاروباری

دەرەوەیە،بەم مەبەستە هاتووەتە ئێران کەناوچەی ئاراراتی بچووك بەرانبەر بە هەندێ خاکی تورکیا کە بریتییە لە شەش گوندی کوردنشین،لە ئێران وەربگرێت.

ئەم مەسەلەیە بە تەدەخولی راستەوخۆی رەزاشا حەل وفەسڵ دەبێ."٣٣"

چەند مانگێك لەوە پێشتر، واتە لەساڵانی ١٩٣٠ و ١٩٣١دا وەزیری دەرەوەی عێراق دوو سەفەری بۆ ئەنقەرە کردووە.لەم دیدارانەدا سەرانی ترك داوایان لە دەوڵەتی عێراق کرد کە((بۆ کۆتایی هێنان بەچالاکی وچەلەنگی یاغیان لە ناوچەی بارزان،کە ژمارەیەك لە کوردی هاووڵاتی تورکیا لەوێندەر جێگیربوون و ئەمن وئاسایشی ناوچەکەیان شێواندووە، دەست بداتە عەمەلیاتی عەسکەری.))!

دەوڵەتی عێراق کە خواخوایەتی((دەرفەتی هیچ جۆرە هەرایەك لە ناوچە سنوورییەکاندا بە بزاڤی کورد نەدات)) بە خۆشحاڵییەوە داوای ترکەکان قەبوڵ دەکات-بەعەمەلی دژی شێخ ئەحمەدی بارزان دەست بەکاردەبێت."٣٤"

لە نیوەی حوزەیرانی١٩٣١دا سەفیری ئێران لەئەنقەرە لە"لای سەفیری بەریتانیا باسی ئەم هاوکارییەی نێوان هەرسێ دەوڵەت،کە مەسەلەی کورد بووەتە مایەی نیگەرانی وباعیسی ناکۆکی بەینی ئەوان،دێنێتە پێشەوەوجەخت لەسەر تەسلیم بوونی شێخ مەحمود دەکات.))"٣٥"

کوردەکان،زۆر پێش ئیمزای پەیمانی سەعد ئاباد(١٩٣٧)دەرکیان بە هاوپەیمانی و یەکێتیی ئەو سێ دەوڵەتە دژ بە کورد کردبوو کە بە هومێد بوون ،رۆژێك بێت بیانکەن بە گژ یەکدیدا!.

۱۸- چارەسەری ترکان بۆ مەسەلەی کورد:

لە ۱۹۳۲/٥/٥دا دەوڵەتی تورکیا قانونێك دەردەكات کە رێی دەدات دەست بداتە گواستنەوەو راگوێزانی جڤاتیوبە هێڤیە بەم تەگبیروپیلانە سروشتوسیمای کوردانەی ستانەكانی رۆژهەلاتی تورکیا بسرێتەوە-ئەمە هەمان ئەو نەخشە وپلانەیە کە دەوڵەتی تورکیا لە زەمانی دیدارەبە نێوبانگەکەی کۆمیسەری بالای بەریتانیا لە بەغدا،دەگەڵ مستەفا کەمال وتۆفیق روشدی بەگ ولە زەمانی دیداری سەفیری بەریتانیا لە قەستەنتەنیە لە مانگی ۱۹۲٦/۱۱ولە مانگی ۱۹۲۷/۱دا خەیالی پێوە لێدەدا.

ئەم قانوونە کە دەسەلاتی سەران وبەگان وئاغایان و شێخانی هۆز وتیرە و تایفەوهەموو بونیادوپێکهاتەکانیان لەغو دەکاتەوە،رێگەی دەوڵەت دەدات کە ئەوانە بۆ بازێرەکانی رۆژاوای ولات رابگوازێ،هەروەها رێی دەوڵەت دەدات((هەموو ئەو کەسانەی گومانی جاسووسیان لێدەکرێ لە ناوچە سنورییەکان))وهەروەها هەموو ئەوکەسانەی کە((لە رۆژهەلاتدا پێگەودەسەلاتێکیان هەیە))دوور بخاتەوە.

(( بیناکردنی گەڕەك وگوندی تازە بۆ خەڵکی غەریرە ترکزمان قەدەغەیە،هەروەها دامەزراندنی سەندیکا وکۆمەڵە بۆ ئەم بابەتە خەڵکە)) مەمنوعە.

لێ راگوێزانودوور خستنەوەی کوردان لە راستیدا بەر لە دەرکردنی ئەم قانونە دەستی پێکردبوو.

لە ئەیلولی۱۹۳۱دوو هەزار کورد-رەنگە لە هۆزی جەلالی- لەگەڵ نزیکەی ٤۰۰۰۰ هەزار سەر لە مەڕومالاتیان بەسەرپەرشتی یەك لیوای ترك سەرانسەری تورکیا تەی دکەنو بەرەو تاراوگە دەرۆن"۳۷"

لەمە بە دواوە خەڵکی تورکیا چاویان بە دیتنی کاروانی گەورەوبچوکی کوردی ڕاگوێزراو ڕادێت کە(( زۆربەیان ژنان ومندالآنی نیمچە روت وپێ خاوسن وبە گوند وشارۆچکە ترک نشینەکاندا رەت دەبن و یەك تابور عەرەبانەیان بە دواوەیە کە نەخۆش و کەسانی لە حاڵی مەرگ و شرە پرە و ناوماڵەکانیان تێدایە)).

ئەم خەڵکە، هەرکە دەگەنە شارێکی برێك گرنگ((بۆ خەستەخانە دەبەن و لەوێندەر دەیان کوتن وگەرماودەکەن...شەو لە نەخۆشخانەکەدا یان لە عاردی یان لەسەر چیمەنتۆی خەستەخانەکەدا ڕادەبوێرن،چونکە تەختە خەویان نادەنێ .))"٣٨"

ئێستا کوردستان بەم خەڵکە رەش ورووتەیەوە وێرانەیەکە بۆخۆی. پێشتریش،واتا لە ساڵی ١٩٣٠دا ئەدموندز مۆڵەتێکی ریزپەڕ لە دەوڵەتی ترك وەردەگرێ وگەشتێك بە کوردستانی تورکیادا دەکات و سەردانی مەرعەش وسیڤەرك و دیاربەکر وبەتلیس وموشی کرد ،بەلاّم لەبەر خراپی رێگە ناتوانێ بگاتە وان،ئەویش لەم گەشتەیدا تەنیا وێرانی و کاولی دیتوە:

بەتلیس رواڵەت ودیمەنێکی خەمناكو دڵتەزێنی هەیە...بە درێژایی نزیکەی دوو کیلۆمەتران کەلاوە لە تەنیشت کەلاوە لە هەردوو رەخی دۆڵەکەدا ریزبووە....ئەمە پاشماوەی شارێکە کە ٤٠٠٠٠ کەسی تێدا بووەو ئێستا گوندێکە کە تەنیا ٥٠٠٠ کەسی تێدایە)).

وەزعوحاڵی موش لەمەش((دڵتەزێنترە. ئەم شارە کە ٢٠٠٠٠ کەسی تێدابوو،ئێستا گوندێکی سێ هەزار کەسییە وگوندێکە کاولو وێرانە!"٣٩" بەر لە شۆرشی دەرسیم لە (١٩٣٧) فرە لەم کەلاوە بەسەریەکاکەوتووانەی کوردستانی تورکیاوە نایەت)).

١٩- سەرچاوە و پەراوێزان :

١- دكتۆر شێركۆ،(جەلادەت بەدرخان)،مەسەلەی كورد ١٩٣٠

٢- ع.قاسملو ل٥٣

٣- بەرنامەی خۆیبوون ،مەسەلەی كورد،دكتۆر شێركۆ.

٤- راپـــــــــۆری هـــــــــەوالگری هێـــــــــزی هـــــــــەوایی پاشایەتی،عەمان،١٩٢٨/٩/٥،وەزارەتی كاروباری دەرەوەی ئینگلستان،٣٧١١٣٠٣٧،٠

٥- قاسملو بەبێ ناوبردنی سەرچاوە دەڵێ پاپازیان لە یەكەمین كۆنگرەی خۆیبووندا بەشداری كردوە.ل٥٣

٦- دكتۆر شێركۆ، وێنەیەكی ئەو میوانداریيەی كە بە بۆنەی كردنەوەی ئەم بەشە ،بەرپاكراوە (لە دیترویت )پیشان دەدات ،ژمارەی بەشدارانی ئەم میوانداریيە ٢٤ كەسن و سێ ژنیان دەگەڵە.

٧- پەیامی تەلەگرافی كۆنسوڵی فەرەنسا لە تەورێز،لە ١٩٢٧/١٢/٥دا.وەزارەتی كاروباری دەرەوەی فەرەنسە ٣١١-٣١٣ e.ل٢٠٠.

٨- هەمان سەرچاوە

٩- نووسراوێك لەمەڕ بزافی كورد،بەرواری ١٩٢٧/١١/٢. وەزارەتی كاروباری دەرەوەی فەرەنسە e٣١١-٣١٣ لاپەڕە ١٩٢

١٠- رۆزیتا فۆربز،بەرلەوەی بۆ ئارارات بڕوات دەستەیەكی دەدوازدە كەسی ئەرمەنی بینی بوو كە توانیبویان لە رووبار بپەڕنەوەوخۆ بگەیەننە خاكی ئێران،لە حاڵێكدا دەیان كەس لە هەڵاتوانی ئەرمەنی بەگوللەی گاردی سنووریی سۆڤیەتی كوژران یان لە روبارەكەدا خنكان.

١١- پـەیامی تەلـەگرافی کۆنـسوڵی تـەورێز لـە١٩٣٠/٨/١٩وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٤٥٨٠

١٢- ((بزوێنـــەرانی شۆرشـــی کـــوردان)) ئینتەرناشـــینالّ پـــریس کورســـپندت١٩٣٠/٨/٢٨، لـــەکتێبی(یـــەکێتیی ســـۆڤیەت و کوردەکـان)ل٣٤١نووسـینی و.هـاوڵ وەرگـیراوە .کتێبەکـەی جـۆرج ئاغـا بـەگۆف(ترسـی نهێنـی روس)کـە لـە روانگـەی رێکخـراوی گ.پ.ئـو کـوردان دەدوێنـێ نابێتـە بەڵگـەی سـەلماندنی روداوی نێـوبراو ،مەگـەر وەختـێ کـە پێچەوانەی ئەم بابەتە بسەلمێت،(بروانە ل١٠١ی کتێبەکەی ئاغابەگۆف)

١٣- پـــەیامی تەلـــەگرافی کۆنـــسوڵی فەرەنـــسە لـــە تـــەورێز لـــە ١٩٢٧/١٢/٥دا،وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسە ٣١٣-٣١١ e

١٤- دکتۆر شێرکۆ، مەسەلەی کورد،هەروەها سفراستیان ،کورد وکوردستان .

١٥- بڕوانە ساڵنامەی جوگرافیایی ، دانانی شانتر ، ١٨٩٣ ، پاریس.

١٦- حەسەن ئەرفەع ، لە سەردەمی پێنج پاشایەتی دا، ل ١٤٨.

١٧-نامەی ١٩٢٨/٢/٢٨ی سورەیا بەگ،وەڵامی حەسکۆ تیللو لە کتێبی مەسەلەی کوردەوە ، نووسینی دکتۆر شێرکۆ دەرهێنراون.

١٨- هەمان کتێب.

١٩- راپۆری مێجەر ئۆلیری،پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لە ئەنکەرە،وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان٣٧١١٤٥٨٠ .

٢٠- دکتۆر شێرکۆ ، هەمان کتێب.

٢١- راپـۆری روزیتـا فۆربز،لـە ١٩٣٠/٧/١٦ وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٤٥٨٠

٢٢- هەمان سەرچاوە، ناوبراو،دوای ئەوەی کە چەند رۆژێك لە ئارارات دەمێنێتەوە روو دەکاتە رۆژاوا بەو ئۆمێدەی کە تابەتلیس بروات.بەلاّم هەر کە لەگەڵ رێنوێنەکەیدا دەگاتە کۆسارەکانی دیار دەریاچەی وان، نزیکی ئارشاس، بۆی دەردەکەوێ کە شەڕی قورس لە بە تلیس وموش و سامسوندا هەیە وناتوانێ درێژە بەسەفەرەکەی خۆی بدات. سەرەنجام دەگاتە رەواندز .

٢٣- پەیامی تەلەگرافی ١٩٢٨/٦/٢٠ی کونسوڵی فەرەنسە لە تەورێز.وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرەنسا . E٣١١-٣١٣ .

٢٤- پەیامی تەلەگرافی کونسوڵی بە ریتانیا لە تەورێز، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٥٣٦٩.

٢٥- راپۆری پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لە تاران،لە ١٩٣٠/٨/٢٦ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٥٣٦٩

٢٦- ئەم زانیاریانە کە لە ژمارەی ١٩٣٠/٨/١٣دا لە رۆژنامەی تایمزی لەندەنی بلاّو بووەوە، لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە بەدرۆخرایەوە .

٢٧- پەیامی تەلەگرافی ئەستانهۆپ پالمری کونسوڵی بەریتانیا لە تەورێز لە ١٩٣١/٧/١٦، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان٣٧١١٥٣٦٩.

٢٨- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٤/١٧ی سەفیری بەریتانیا لە تاران. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٥٣٦٩.

٢٩- پەیامی تەلەگرافی١٩٣١/٧/١٦ی کونسوڵی بەریتانیا لە تەورێز.وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١٥٣٦٩.

٣٠- چاوپیکەوتن لەگەڵ ئێران بلاّو کراوەتەوە ، ١٩٣١/٧/١٠

٣١- پەیامی تەلەگرافی١٩٣١/٧/١٦ی کونسوڵی بەریتانیا لە تەورێز.

٣٢- هەمان سەرچاوە ، ١٩٣١/٧/٢٣

٣٣- حەسەن ئەرفەع ، لە سەردەمی پێنج پاشایاندا، لە ٢٣٠-٢٣١.

٣٤- بڕوانە نامەی ١٩٣١/٤/٣ی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١١٦٩١٦.

٣٥- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣١/٦/١٧ی سیرکلارك، قەستەنتەنیە،وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١١٥٣٦٩.

٣٦- لە رامبو(PereBois) کوردان وهەق ، ل ٣٢-٣٣ وەگیراوە.

٣٧- پەیامی تەلەگرافی١٩٣١/٩/٢٢ی کونسوڵی بەریتانیا لە تەورێز.

٣٨- پەیامی تەلەگرافی ١٩٣٢/١٢/٢٠ی و.دماتیوز، کونسوڵی بەریتانیا لە مرسین، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١١٦٩٨١.

٣٩- راپۆری ئەدموندز، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلستان ٣٧١١١٤٥٧٩.

# حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ۱۹٥۱دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی ۱۹۷٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (۱۷۰) رۆژنامەی هاوکاری لە ۱۹۷۳/٦/۸ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ۱۹۷٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ۲۲۲، گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ۲۲۲ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار

هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسی نەبووە, لە ساڵی ١٩٧٤ — ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩

٢-کۆچی سوور، رۆمان, چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧

٣-بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨

٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٥-لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان

٦-کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ

٧-نینا، رۆمان، سابت ڕەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

٨-نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایەسلێمانی

٩-رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧

١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.

١١- هاومالەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان

١٢ – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦

١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق

١٤- دووره وڵات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان

١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨

١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر

١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥

١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦

١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك

٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی

٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك

٢٢-دیدارو دەق و رەخنە،چ٢٠٠٥،١

٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك
٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ
٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا، یەك چاپ
٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧
٣١ –کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(          )دەزگای موکریانی
٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە
٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی

٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلائەلبوسێری..
٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)
٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چا،دەزگای سەردەم 2009
٥١- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف، چا(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چا، ٢٠٠١
٥٣- چزیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠ خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان

٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٦- ریالیزم‌ودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ١،٢٠٠٤،دەزگای سپیرێز

٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ١،٢٠٠٦دەزگای موکریانی

٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی

٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦

٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی

٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦

٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦

٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ١،٢٠٠٧

٧٥- دەربارەی رۆمان‌و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨

٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك

٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی

٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف

٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤

٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف

★ لە راپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..

★ ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...



ژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا

ئەو کەسانەی کە لە کارێن پڕ شانازی
رابردووی میللەتی خۆ بێخەبەرن،
ناتوانن ئارمانجی پێشخستن و بەرز
کردنەوەی ئاستی میللەتەکەی خۆیان لە
مێشکی خۆدا پەروەردە بکەن.
بێئاگایی لە رابردوو دەبێتە مایەی
فەرامۆش کردنی ئایندە! دەڵێن شانازی
بە کێلی قەبرەوە ناکرێت، لێ سەر
هەڵدان و بتەوبوونی هەستی پاراستنی
ئازادی لە نێو میللەتاندا پێوەندی بە
زانینی کارە پڕ لە شانازیەکانی باب و
باپیرانەوە هەیە! جێی خۆیەتی بڵێین کە
ئەو شانازیانە چرای رێنوێنی رێگەی
شکۆی میللەتانە.

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی سایە



نرخ: ٤٠٠٠

دیزاین: ئارام عەلی مەجید